زنجیرەی بابەتە هەنوکەییەکان

ئەلقەی دووەم

عەلی باپیر

# باوڕیابین

نوزاد

## داڕوخانی ڕەووشت

## کۆمەڵگاکەمان بەرەو هەڵدێر دەبات





بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن

# باوڕیابین

## دارووخانی ڕەوشت

کۆمەڵگاکەمان بەرەو هەڵدێر دەبات

عەلی باپیر




بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن.

ناوی کتێب: باور یابین داڕوو خانی ڕەو شت کۆمەڵگە کەمان بەرەو هەڵدێر دەبات
نوسەر: عەلی باپیر
بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر/ هەولێر
خەت: نەوزاد کۆیی
بەرگ: أمین مخلص
ساڵی چاپ: 1427ک – 2006ز
تیراژ: 3000 دانە

لە کتێبخانەی گشتی هەولێر ژمارەی سپاردنی (950) ی ساڵی 2006

تفسير
بۆ بڵاوکردنەوە و راگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت: ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل: ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢ ٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿ وَإِذَا أَرَدْنَا أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيْهَا الْقَوْلُ فَدَمَّرْنَاهَا تَدْمِيرًا ﴾ (الإسراء- 16)

# پێشــکەش بێ

- بەو گەنچ و لاو(کچ و کور)انەی کە لە تافی لاوێتی‌دا، بە هۆی ئیمان و تەقواوە، لە بەردەم گێژەڵوو کەی فە سادو ئارەزووبازی ئەم ڕۆژگارەدا، وەك کێو ڕاوەستاو و نەلەخشاون.
- بە هەموو ئەو کەسانەی کە دڵ سۆزی میلـلەت و وڵاتەکەیانن و، لەبەرامبەر پاراستنی کەرامەت و شەرەف و ڕەوشت و ئەدەبی کۆمەڵگاکەیان دا هەست بە بەرپرسیارێتی دەکەن و ئەرکی سەرشانیان جێبەجێ دەکەن.

# پێشــەکی

الحمدلله والصلاة والسلام على رسول الله وآله المهتدين بهداه

خوێنەری بەرێز :

لەپێشەکی چاپی سێیەمی ئەم نامیلکەیە بە پێویستی دەزانم ئاماژە بە چەند خاڵێك بکەم:

1- بێگومان ئینسان بەبێ خوو ڕەوشتی بەرزو پەسند بەرزو جوان ناتوانێ ژیانێکی پاك و چاك و بەختەوەرانەی شایستەی ئینسان بەرێتە سەرێ .

بۆ نموونە :

ئایا خەڵك و کۆمەڵگایەك لە جیاتی ڕاستیی و ساغیی، درۆو دەلەسەو فرت و فێڵ و، لە جیاتی بەزەیی و پەرۆش و یەکدی خۆشەویستن و ڕێز لە یەکدی گرتن، دڵڕەقیی و بێ ڕەحمی و بوغزاندن و بەسووك سەیرکردنی یەکدی و، لەجیاتی شەرم و شکۆ، بێشەرمیی و بەندو باریی و، لەجیاتی داد گەریی، ستەم و زۆرو، لە جیاتی ئەمان خیانەت و، لە جیاتی خۆ بە کەمگریی و خاکیێتی، خۆ بەزلگریی و فیزو کە شخە نواندن و، لەجیاتی دڵسافیی، سینەپیسی ... هتد بکەنە پیشە لەبواری ڕەفتارو مامەڵەیان لەگەڵ یەکدیدا، چۆن دەگونجێ بە کۆمەڵگایەکی ساغو سەلیم و تۆکمە ڕێکوپێك دابنرێ ؟!!

دیارە هەر بۆیەشە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووویەتی (فاذا رأيت هوىً متَّبعاً، وإعْجاب كلِّ ذي رأي برأيه فعليك بخويصة نفسك وَ دَع عنك أمْرَ العامَّة) واتە: جا هەر کات لە کۆمەڵگادا بینیت خەڵك شوێن ئارەزووان دەکەون و ڕژدیی و چرووکی یان بەسەردا زاڵ بووەو، هەرکەسە بەس بیروڕای خۆی پێ ڕاستەو بە کەس ڕبەی کەس ناپێویت، ئەوە لە گەڵ خۆت خەریك بەو واز لە خەڵك بێنە ..

دیارە مەبەستی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەیە کە کاتێك (خەڵك و کۆمەڵگایەك ڕەفتارو خەسڵەتە نزم و پەستەکانی تێدا بڵاودەبنەوەو تێیدا تەشەنە دەکەن کەسێك کە توانای گۆڕین و چاکسازیی نەبێ، وا سەلامەت ترە کە گۆشەگیرو خۆپاریز بێت نەوەك ئەویش بەو دەردو نەخۆشیانەوە گیرۆدەبێ کە تەشەنەیان کردوە .

2- شتێکی ئاشکرایە کە وڵاتی ئێمەش (کوردستان و عێراقیش) کەم و زۆر پڕیشکی ئاگری ئەو تەوژمە ماددیگەرایی و ئارەزوو پەرستیی و بێ بەندو بارییەی کە بە هۆی شارستانێتی ڕۆژئاوای ژیان بە ماددە دانەرو مرۆڤ بە ئاژەڵ و سەیرکەرەوە، سایەی شوومی بەسەر دنیادا کێشاوە، بەرکەوتوەو توێژێکی فراوان کەمو زۆر دەستی پێیەوە چزاوە.

ئینجا گومانیشی تێدانیە کە هەمیشە خەڵك خستنە شوێن هەواو ئارەزووەکانیان ئاسانترە لە ئیقناع کردن و وادارکردنیان بە خۆ ڕازاندنەوە بە خووڕەوشتە بەرزو جوانەکان. چونکە شوێن هەواو ئارەزوو کەوتن- کە مرۆڤ گیرۆدە دەکات بە خوو و خەسڵەتە نزم پەرستەکانەوە- وەك خلۆر بوونەوەو سەرەوژێربوونەوە وایە لە بەرزاییەوە بۆ نزمیی و نشێو، بەڵام خۆڕازاندنەوە بە ئەدەب و بەهاو ڕەوشتە بەرزو جوانەکان، وەك سەرکەوتن و بەرزبوونەوە وایە بە هەورازدا! هەر بۆیەش پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووەتی: (حفت الجنة بالمكاره وحفت النار بالشهوات) (متفق عليه) واتە: بەهەشت بە سەختیان دەورە دراوەو ئاگر (دۆزەخ)یش بە ئارەزووان تەنراوە.

کەواتە: پێویستە هەموو لایەك بزانین کە پرۆسەی پێشگرتن لە (داڕووخانی رەوشت و خووی بەرز)و رێ گرتن لە بڵاوبوونەوەو تەشەنەکردنی خوو وخدەو رەفتارە دزێو و ناقۆڵاو زیان بەخشەکان کارێکی قورس و بەزەحمەتەو ئاسان نیە، دیارە هەمیشەش بیناکردن لە ڕووخاندن و تێکدان قورسترە!

3- بڵاوبوونەوەو پەرەستاندنی رەوشت و خووی دزێوو ناشیرین وەنەبێ تەنها لە لایەنێك و دووانەوە زەرەرو زیان بە کۆمەڵگایەکەمان بگەیەنێ، بەڵکو زیانەکانی گشتیی و هەمەلایەنەن ولە ڕووی:

ئەمـ ـنـی نە ـتەوەیی، سیا ـسی، ئا ـبـووری، کۆمـەلا ـیەتی، فیکریی.. هتدەوە زیانمان لێدەدات، چونکە بە داڕووخانی ئەدەب و ڕەوشتە بەرزەکان و ژێر خانی روو حی و فیکر ـیی و کلـ توریی کۆمـەڵگا هەڵدەتەکێ و، بڵاووبونەوەی خوو خدەو رەو شتی ـبەدو دزێویش وەك دەردو پەتایەك سەرجەم لایەنەکانی ژیان و گوزەران گەندەڵ دەکات .

4- دیارە بەرەنگاربوونەوەی دیاردەی داڕوو خانی خوو رەو شتی بەرزو پەسندو تەشەنەکردن و بڵاوبوونەوەی رەفـ تارو خوو و خدەی نزم و پەستیش ئەرکی سەرشانی هەموو لایەکە ـنەك تەنیا هی ئیسلامییەکان و زانا ـیانی ئیـ سلام و ... هـ تد . چونکە بەهرەمەند لە رەو شت و خووە ـبەرزو پە سندەکان هەمووومان و زەرەرمەندیش لە هی خراپ و ـنزم و دیـ سان هەموومانین ! ئایا تا ـکەکانی کۆ مەڵگا تێ کڕا لە ساغ و سەلامەتی و خێرو خۆشی نێو کۆمـەڵگاکەیان قازانج ناکەن و هەمووشیان ـلە دەردو نەخۆ شیی و گرفتاریـ یەکانی زەرەر ناکەن؟!

5- چارەسەری دیاردەی داڕووخانی رەوشت و خووی پە سندیش پێویستە هەم گشتگیرو هەمەلایەنە بـ ـێت و هەم قووڵ و ڕیشەییش بێ.

مەبەستیشم لە گشتگیریی و هەمەلایەنەیی ئەوەیە کە سەرجەم توا ـناو وزە سیا سی و کۆمەلا ـیەتی و ـئابووریی و فیکر ـیی و

ئیعلامیی ... هتدەکانی بۆ بخرێتە گەڕو لە هەموو ڕێیەکانەوە بۆی بچین ، دیارە دەردو نەخۆشییەکیش زیان بە هەموو کەس و سەرجەم لایەنەکانی ژیان و گوزەرانی تاك و خێزان و کۆمەڵگا بگەیەنێ پێویستە تێکڕای وزەو توانایەکانیش بۆ چارەسەرکردنی دابین بکرێن .

مەبەستیشم لە (قووڵ و ریشەیی) ئەوەیە کە بەهێزترین سەنەدو پشتیوانی ئەدەب رەوشتی بەرزو جوان  به تایبەتی بۆ خەڵکێکی مسوڵمان  بریتیە لە ئیمان و پەیوەندی مەحکەم و ڕاست و دروست بە خواوە، بۆیە پێویستە لێرەشەوە واتە لە بووژاندنەوەو بەهێزکردنی ئیمان وعەقیدەو گیانی خوا پەرستیی و دینداریی لە عەقڵ و دڵی خەڵکەکەمان  بە تایبەتی چینی گەنج و لاودا  بیر لە چارەسەری دەردی ناوبراو بکەینەوە، پێشینانیش گوتویانە: ((ئاو کە لە سەرچاوە لێڵ بوو، لە جۆگایە ڕوون نابێتەوە)) .

ئیدی بەهیوای ئەوە کە بە هەوڵ و هیممەتی دڵسۆزانی گەل و کۆمەڵگایەکەمان بتوانین خەڵکەکەمان لە داڕووخانی رەوشت بپارێزین کە بە تەئکید مایەی پوو چەڵیی و گەندەڵییەتی و، بە عەیبداریی دنیاو گوناهباریی قیامەتیشی تەواو دەبێ.

سبحانك اللهم وبحمدك اشهد الا اله الا انت استغفرك واتوب اليك

24 رمضان 1427
2006 / 10 / 16
**هەولێر**

## ئەم نامیلکەیە

ئەم نامیلکەیە بریتی یە لە دەقی ئەو وتارەی کە بەندە لە سەر مینبەری مزگەوتی (جیهاد) لە شاری (سلیمانی) داویەتی، لە ڕۆژی جومعە (5ی ڕەبیعی یەکەمی 1423) بەرامبەر (2002/5/17) لەژێر هەمان ناوونیشاندا (با وریا بین! داڕووخانی ڕەوشت کۆمەڵگاکەمان بەرەو هەڵدێر دەبات).

پاشان برای دڵسۆزو خۆشەویستم کاك(مەلا بیلال قەڵادزەیی) لە کاسێتەوە هێناویەتە سەر قاقەز، خوا پاداشتی بداتەوە، دوایی خۆشم پێیداچوومەتەوەو چاوم پێیدا گێڕاوەتەوەو لە چەند شوێنێك دا هەندێك وشەو ڕستەیم دەستکاری کردوەو بێجگە لە زیادکردنی چەند ڕستەیەکی کەم لە چەند جێیەکدا، وتارەکە کتومت وەك خۆی ماوەتەوە.

گومانیشی تێدا نیە کە بابەتی ئەدەب و ڕەوشت و خوو بەگشتی و بە تایبەت ئەو بەشەی ئەدەب و ڕەوشت و ئاکار کە پەیوەستە بە پەیوەندی نێوان ئافرەت و پیاوو لایەنی جینسییەوە، بابەتێکی یەکجار هەستیارو گرنگە و پێویستە- ئەگەر بویسترێ هەقی خۆی بدرێتێ- نەك وتارێك و دووان و نامیلکەیەك بگرە چەندان وتارو نامیلکەو کتێبی سەربەخۆی بۆ تەرخان بکرێن،

بەڵام وەك گوتراوە، ئەوەی فریای هەموویشی نەکەوی نابێ هەندێکیشی لێ فەرامۆش بکرێ (مالا یدرك كله لايترك بعضه).

هیواداریشم ئەم وتارو نامیلکەیە لەگەڵ کورتیشی دا پوختبێت و جەوهەرو کاکڵەی مەسەلە پێویستەکانی ئەم بابەتە گرنگ و گەورەیەی خستبێتە ڕوو و تیریك بووبێت چەندان نیشانەو ئامانجی پێکابن!

ئەحمەدئاوا
2002/7/11 ز





# دەقی وتـارەكـە

ان الحمدلله نحمده و نستعينه و نستغفره و نستهديه، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا، من يهده فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد ان لا اله الا الله وحده لا شريك له وأشهد ان محمدا عبده ورسوله صلوات الله تعالى وسلامه عليه و على اله وصحبه ومن اهتدى بهديه.

اما بعد: أوصيكم عبادالله و قبلكم نفسي بتقوى الله قال- جلّ وعلا- في محكم كتابه: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلاَ تَمُوتُنَّ إِلاَّ وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴾.

## دەستپێك

موسڵمانە بەڕێز و خۆشەویستەکان، خوشکان و برایان! لە وتاری ئەمڕۆماندا لە ژێر ناوونیشانی (باوریا بین داڕووخانی ڕەوشت کۆمەڵگاکەمان بەرەو هەڵدێر دەبات) لەژێر ئەم ناوونیشانەدا وتاری ئەمڕۆتان ئاراستە دەکەم، کە تەرخانم کردوە بۆ باسی دیاردەیەکی زۆر ترسناك، کە لە سەرەتاسەری دنیادا لە پەرەسەندن دایەو کەموزۆر پڕشکیشی گەیشتۆتە کۆمەڵگای کوردەواریمان.

ئەویش بریتییە لە دیاردەی (داڕووخانی ڕەوشت) بە تایبەت لە بواری جینسی و لە بواری پەیوەندییەکانی نێوان پیاوان و ئافرەتاندا کە بوارێکی زۆر حەساس و گرنگ و بایەخدارەو، شەریعەتی خوای پەروەردگار چ ئایەتەکانی قورئان، چ سوننەتی پێغەمبەر ﷺ پانتاییەکی زۆریان تەرخان کردوە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو لایەنە کە لە ڕووی شەرعییەوە میللەت و کۆمەڵگایەکی موسڵمان پیاوان و ئافرەتانی، نێرو مێیەکانی، پێویستە چۆن بەیەکەوە ڕەفتار بکەن؟ وە چۆن لە ڕووی جینسییەوە مامەڵە بکەن؟ جا ڕەنگە زۆر لە موسڵمانان تاڕادەیەك پێیان شتێکی سەیربێ کە لەسەر مینبەری پێغەمبەرەوە ﷺ

باسی ئەو جۆرە بابەتانە بکرێ، بەڵام لە ڕاستیدا نەك هەر سەیر نیە، بەڵکو زۆر شتێکی ڕەوا یەو زۆر شتێکی ئا سایيە کە ئايە تەکانی قور ئان کە خوای کار بەجێ ناردوونی، وە فەرمايشتەکانی پێغەمبەر ﷺ چ پەيوەندی يان بە حوکم و سياسەتەوە هەبێت، چ بە لايەنی ئيمان و عەقيدەوە، چ بە لايەنی ئابوورييەوە چ بە لايەنی پەيوەندييە کۆمەڵايەتييەکانەوە، چ بە لايەنێکی ديکەوە، پێويستە بێ پەرواو بە ڕاشکاويی و بە ڕوونی بخرێنە بەرچاوی موسڵمانان، بۆ ئەوەی بە شێوەيەك لە هەموو ئەو بوارانەی ژيان و گوزەرانيان دا بجووڵێنـــەوە هەڵسوکەوت بـکەن کە لە ميللەتێکی موسڵمان و لە کۆمەڵگا يەکی مو سڵمان بوەشێتەوەو شايەستەيان بێت.

دیارە چ(بەندە)چ هەر وتاربێژ (خطیب)ێکی دیکە کە لە سەر مینبەری پێغەمبەر ﷺ ڕادەوەستێ و وتاری هەینی (جمعە) یان هەر وتارو هەر ئامۆژگارييەکی هەر بۆنەيەکی ديکە ئاڕا ستەی موسڵمانان دەکات، دەبێ لە ڕووی دڵسۆزيی و بەزەيی و پەرۆشەوە لەگەڵيان بدوێ، منيش ئەم وتارەم و هەر و تارێکی ديکە شم سوپاس بۆ خوا هەر لەسەر ئەو بناغەيەو هەر بەو شێوەيەو بەو هاندەرەيە.

پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هەمیشە بە میللەتەکانی خۆیانیان فەرموەوە: ﴿ وَأَنَا لَكُمْ نَاصِحٌ أَمِينٌ ﴾ (الاعراف - 68) واتە: من بۆ ئێوە دڵسۆزێکی[1] ئەمیندارم[2].

وەك پێغەمبەری خوا (محمد المصطفى) ﷺ لە یەکێك لە فەرمایشتە شیرینەکانیدا دەفەرموێ: (الدين النصيحة) رواه مسلم، واتە دینداریی بریتیە لە دڵ سۆزیی و پەرۆش و ساغیی، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ تێ کرای مو سڵمانەتی و دی نداریی لە دڵسۆزیی و بەزەیی و پەرۆش بۆ موسڵماناندا کورت دەکاتەوە! جا دیارە دڵسۆزیی بابا یەکی زا ناو پێ شەواش بۆ میللەتە کەی لەوەدایە کە هەرچی خێرو چاکەی ئەوانی تێدا یە دە بێ بۆ یان بخاتە ڕوو، وە ڕاشکاوانە نوختەیان بۆ بخاتە سەر پیتەکان و، جوان جوان حاڵی یان بکات لە حەڵاڵ و حەرامێك کە خواو پێغەمبەری خوا فەرموویانەو ناردوویانە، وە سنوورەکانی حەڵاڵ و حەرام و سنوورەکانی تاعەت[3] و مەعصیەتیان[4] جوان جوان بۆ ڕۆشت بکاتەوە.

---

(1) ( ناصح) واتە: دڵسۆز، خاوەن بەزەیی و پەرۆش و خەمخۆر.

(2) (أ مين) وا تە : ئەمی ندار، کە سێك کە شای ستەی ئەوەبێ سپاردەی پێ بسپێری،(امین) پێچەوانەی (خائن)ە واتە: من لەگەڵ ئێوە دەست پاکم و دەم پاکم و ئەمیندارتانم، وە دڵسۆزیشتانم و بەخەمتانەوەم و پەرۆشتانمە.

(3) الطاعة: فەرمانبەرداری و بەقسەکردن.

(4) المعصیە: سەرپێچی و کەللەڕەقی.

جا سوپاس بۆ خوا خوشك و برایانی موسڵمان! کە ئـێوە وەك ئەهلی ئەم مزگەوتە[5] (مزگەوتی جیهاد )چ برایان چ خو شکان خوا پێدراون و هیدایە تدراون، بەڵام من ئەو بابەتە ڕوون دەکەمەوە بۆ ئەوەی هەم ئێوە بەرچاو ڕوونانەترو عەزیمەتدارانەتر ئەو ڕێبازەی گرتووتانە کە ڕێبازی پێغەمبەرە ﷺ پێیەوە پابەندبن و لەسەری بڕۆن، چ خوشکان چ برایان ئەو ئەدەب و ڕەوشتە ئیسلامییانەی کە خۆتان پێ ڕازاندووەتەوەو ڕەچاویان دەکەن پێیانەوە پابەندن، زیاتر خۆتانیان پێبڕازێننەوەو زیاتر جەختیان لەسەر بکەن، وە پاشانیش لە پشت ئێوەیشەوە قسەکانم ڕوویان لەو خەڵك و میللەتەی خۆمانە بە گشتی، ئەم کۆمەڵگایەی خۆمان کە خۆمان لە بەرامبەریدا بە بەرپرسیار دەزانین وە خۆشمان بۆی بە خاوەنی بەزەیی و پەرۆش دەزانین، مەرج نیە ئێمە هەر خۆمان بە دڵسۆزی ئەهلی مزگەوت بزانین، ئەوانەی کە لە دەرەوەی مزگەوتیشن، سەرجەم ئەوانەی کە ئوممەتی پێغەمبەرن ﷺ بگرە بەزەیی و پەرۆش و دڵسۆزییمان بۆ تێکرای خەڵك و میللەتی کوردستانە، چ ئەوەی کە ڕوو لە قیبلە دەکات، وە چ ئەوەی کە ڕووشی تێناکات، چونکە ئێمە کە سێك کە وەك برایەکی دینی و خوشکێکی دینیش بۆی بە بەزەیی و

(5) هەروەها ئەهلی هەموو مزگەوتەکانی دیکەش هەروان بە گشتی بەڵام لەو کاتەدا ڕووی قسان لەوان بوو.

پەرۆش نەبین، وەك ئیند سانێك کە خوا خوڵقاندوو یەتی بۆ بەندایەتی خۆی و پابەندیی بە ئایینەکەیەوە بۆ ئەوەی بە هۆی بەندایەتیکردنی بۆ خوای پەروەردگارو دادگەر (تبارك و تعالى)و شوێنکەوتنی شەریعەتەکەیەوە سەربەرز و ڕووسوور و سەرفرازی دنیاو دوارۆژ بێ لەو ڕووەوە بۆ ئەویش هەر دڵسۆزین.

ئەوەش بیدعەتێك نیە خۆمان دایبهێنین بەڵكو سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەرە ﷺ پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك چوو بۆ لای گەلی (طائف) تاکو بانگیان بکات بۆ لای خوا بۆ بەندایەتی بۆ خوا بۆ ئەوەی سەرفرازو بەختەوەری دنیاو دوارۆژ بن، کە چی ئەوان زۆر نانەجیبانەو بێنەزاکەتانە وەڵام یان دایەوەو بەرد بارانیان کرد ، لەو کاتەدا(جبریل) سەلامی خوای لێ بێخوای پەروەردگار ناردی بۆ لای (محمد المصطفى)ﷺ فەرمووی: ئەوە خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ئەگەر حەز دەکات تاکو فەرمان بکەم بە فریشتەی چیایەکان و ئەو دوو چیا بەرزو سەرکەشە- کە شاری (طائف)یان کەوتوەتە نێوان- بە سەریاندا بڕووخێنم و قەڵاچۆو بنبڕ بکرێن, مادام ئاوا ئیهانەیان بە پێغەمبەری خوا کرد, بەڵام پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (6) نەخێر, ڕام لەسەر ئەوە

---

(6) پێغەمبەر ﷺ لە یەکێك لە پێغەمبەرانی خواوە گێڕاویەتەوە کە لە بەرامبەردا فەرموویەتی: (اللّهم اغفر لقومي فانهم لايعلمون ) متفق عليه. واتە: خوایە لە گەلەکەم ببوورە چونکە نەزانن  بۆیە وا دەکەن!.

نیە, ئەوجا فەرمووی: ئومێدی ئەوە دەکەم لە خوای پەروەردگار کە ئەوانەش هیدایەت نەدرێن لەوەچە (نسل)ی ئەوانە کەسانێك پەیدابن کە سەجدە بۆ خوا بەرن و بەندایەتی بۆ خوا بکەن, وەك (بخاری و مسلم) لە (عائشة)وە خوا لێی ڕازی بێت گێڕاویانەتەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ پێشەوای ئێمە ئاوا بە بەزەییانەوە ئاواش دوور بینانە لەگەڵ خەڵکدا ڕەفتارو مامەڵەی کردوە, وە بەو شێوەیە بۆیان بە پەرۆش و بە بەزەیی بووە.

جادیارە من وەك عادەتی خۆم بۆ ئەوەی کە باشتر مەبەستەکە ڕوون بێتەوە بۆم خستونە چەند خاڵێکەوە:

## خاڵی یەکەم: ڕەوشت و خووی بەرزو پەسەند شوورەو حەسار و پەرژینی کۆمەڵگایە:

دیارە مەبەستمان لە ڕەوشت و خووی بەرزو پەسەند، مانای فراوانی ڕەوشت و خویە، چ پەیوەندی بە لایەنی جینسییەوە هەبێت کە ئەم وتارەمان بۆ تەرخان کردوە، چ پەیوەندی بە لایەنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانەوە هەبێت، چ پەیوەندی بە لایەنی حوکم و سیاسەتەوە هەبێت، چ پەیوەندی بە لایەنی بازرگانی و مامەڵەو سەوداوە هەبێت - واتە لایەنی ئابووری، وە چ پەیوەندی بە لایەنی جەنگ و جیهادەوە هەبێت، لە هەموو ئەو لایەن و

بوارانەدا شەریعەتی خوای کاربەجێ کۆمەڵێك ئاداب و ڕەو شتی بەرزو جوانی بۆ موسڵمانان دەستنیشان کردوە، کە دەبێ خۆیانیان پێ بڕازێننەوە.

موسڵمان چ پیاو چ ئافرەت، چ پیـر چ گەنج، چ ورد چ درشت، هەر هەمووی لە قورئان و سوننەتدا کۆمەڵێك ئاداب و ڕەوشتی بەرزی بۆ دیاریکراوە، کاتێك بە موسڵمانی تەواو عەیار لە قەڵەم دەدرێ کە ئەو ڕەوشت و ئادابە بەرزانە ئەو ئەخلاقە جوان و دڵگیرو پەسەندانە ڕەفتار پێ بکات و خۆییان پێ بڕازێنێتەوە.

پێغەمبەر ﷺ لە زۆر لە فەرمایشتەکانی دا باسی گرنگی و بایەخی ڕەوشت و خووی کردوە کە ئێمە هەر ئاماژەی پێ دەکەین:

بۆ وێنە دەفەرموێ: (إن المؤمن لَيُدْرِك بِحُ سْنِ خُلُ قِه در جة الصائم القائم) (أبوداود عن عائشه رضى الله عنها). واتە: (ئیما ندار بە هۆی ڕەوشتی جوانییەوە دەگاتە پایەو مەقامی کە سێك کە هەمیشە بەڕۆژوویە (ڕۆژووی سوننەت)وە هەمیشەش شەونوێژ دەکات).

واتە: ئەگەر کەسێك هەبێ هەمیـ شە شەوەکان نە خەوێ و شەونوێژ بکات، ڕۆژەکانیش هەمیشە ڕۆژووی سوننەت بـ گرێ، ئینسان بەهۆی ڕەوشتی جوانییەوە چ پیاو بێ چ ئافرەت دەگا تە ئەو پلەیە.

لە فەرمایشتێکی دیکەدا دەفەرموێ: (مامن شيء أثقل في ميزان العبد المؤمن يوم القيامة من حسن الخلق) (رواه الترمذي) وقال: حسن صحيح، رياض الصالحين، ص 228.

واتە: (قورسترین شت لە تەرازووی چاکەکانی ئینسانی موسڵماندا لە ڕۆژی دواییدا ڕەوشتی جوانە)، ڕەوشتی جوان لە هەموو شتێك قورسترو گرانترە.

هەروەها خوای پەروەردگار کە ویستوویەتی مەدح و ستایشی پێغەمبەری خۆی ﷺ بکات لە بەرانبەر پڕوپاگەندەو تۆمەتی جۆراوجۆری کافرەکاندا کە ڕۆژێك پێیان دەگوت شێت (مجنون)ە و ڕۆژێك دەیانگوت جادووگەر (ساحر)ە ڕۆژێك دەیانگوت فاڵچی (کاهن)یە، جا خوای پەروەردگار بە چی بەرپەرچی ئەو پڕوپاگەندانە دەداتەوە؟ دەفەرموێ: ﴿ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ، ن وَالْقَلَمِ وَمَا يَسْطُرُونَ (1) مَا أَنتَ بِنِعْمَةِ رَبِّكَ بِمَجْنُونٍ (2) وَإِنَّ لَكَ لَأَجْرًا غَيْرَ مَمْنُونٍ (3) وَإِنَّكَ لَعَلى خُلُقٍ عَظِيمٍ (4)﴾ (القلم).

بەوە بەرپەرچی پڕوپاگەندەی نەحەزانی پێغەمبەر ﷺ دەداتەوەو دەفەرموێ: چونکە تۆ ڕەوشتێکی بەرزو گەورەو پەسەندت هەیە ئەی (محمد) ﷺ تۆ شێت و جادووگەرو فاڵچی نی، پڕوپاگەندەو تۆمەتەکانیان ناڕاستن چەنکە تۆ ڕەوشت زۆر بەرزو جوانە.

دەگونجێ ئینسان زانا بێت، دەگونجێ لە عیبادەتدا زۆر خۆی

ماندوو بکات، دەگونجێ زۆر خاوەن دەسەلاَت بـ یێت، وە هەروەها بەلاَم مەگەر پەیوەندی زۆر قایم و مەحکەمی لەگەڵ خوا ( جلّ جلاله) هەبێ، مەگەر عەبدی زۆرباش بێ بۆ خوا، ئە گەرنا ناتوانێ هەمیشە ڕەوشتی بەرزو جوانی هەبێت، جا وەك زانا یان گوتوویانە: خوای پەروەردگار ئەوەندە بە ڕەوانبێژی (بلاغە) یەوە ئەوەی فەرمووە، نەیفەرمووە: تۆ ڕەوشتێکی جوانت هەیە، بەڵکو دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّكَ لَعَلى خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾(القلم -4)،(إِنَّ) ئەداتی تەئکیدە، واتە: بە تەئکیدی تۆ (لَعَلى خُلُقٍ عَظِيمٍ) واتە: وەکو ئەوە کە ڕەو شتی بەرزو جوان ولاَخێکی سواری بـ یێت و پێغەمبەریش ﷺ سواری بوویێت و لەسەر پشتی بـ یێت، واتە ئەوەندە ڕەوشت بەرزی، وەك ئەوەی کە ڕەو شت بەرزیی بۆ تۆ بوویێتە (مرکوب)ێك، تۆش لەسەری سەقامگیر بووبی.

وە شاعیرێك زۆر جوان دەڵێت:

(وانما الامم الاخـــلاق ما بقيـــت

فان هموا ذهبــت أخلاقهـــم ذهبوا )[7]

واتە: میللەتان بریتین لە ڕەوشتی بەرزو جوان هەر کاتێك ڕەوشتی بەرزو جوانیان لە نێودا نەماو داڕووخا ئەوانیش دەڕۆن و کۆتاییان پێ دێت.

---

(7) کە (احمد شوقی)یەو ناسناوی (امیرالشعراء)ی هەبووە.

مەبەستمان لە ڕەوشتی بەرزو جوان وەك گوتم: ئەوە نییە کە ئافرەت خۆی دابپۆشێ و پیاو بە حەرامی بۆی نەڕوانێ و ئاگایان لە داوێنی خۆیان بێت و عەورەتی خۆیان دابپۆشن و ئەو چەند شتانەو بەس، نەخێر, مەبەستمان پێ مانای فراوانی ئەو وشەیە هەر لە ڕاستگۆیی و ڕاستبێژی, هەر لەدەم پاکی و دەست پاکی, هەتا سەخاوەت و بەخشەندەیی, هەتا جوامێری و شەهامەت و بوێری, هەتا بەزەیی و سۆزو دڵسۆزی و پەرۆش لە گەڵ خەڵك, هەتا خاوەن بەڵێن و پەیمان بوون, پێدا برۆ تا کۆتایی ئەو لیستەی کە زۆر درێژە جا ڕەوشت و خووی بەرزو جوان بەمانای فراوانی ئەو وشەیە سیاج و پەرژینێکە بەدەوری هەر میللەت و کۆمەڵگایەکەوە, میللەت وکۆمەڵگاکان بە ڕەوشتی بەرزو جوان دەتوانن بەیەکەوە بژین, ئەگەر خەڵك لەگەڵ یەك ڕاست بوو, ئەگەر بەرامبەر بە یەکترو لە یەکتر ئەمین بوون, ئەگەر لەگەڵ یەکتردا دەست پاك بوون, ئەگەر تەماعیان لە نەفس و ناموسی یەکتر نەبوو, ئەگەر گەنج ڕێزی لە پیر گرت پیرەکەش بەزەیی بە بچووکدا دەهاتەوە، ئەگەر ئافرەتان بەو شێوەیە کە شەرع بۆی داناون پۆشتەو پەرداغ بوون. ئەگەر پیاوان بەو شێوەیە کە شەرع بۆی داناون خاوەن ئەدەب و ئابڕووو کەرامەت بوون ناموس و کەرامەتی خەڵکیان پێ وەك هی خۆیان بوو، ئەگەر هەموو چین و توێژەکان بەو شێوەیە کە شەریعەت بڕیاری داوە ڕەفتاریان بە

یەکەوە کرد، بۆ نموونە: حوکمڕان و کاربەدەست داد گەرو ڕەعیەتیش گوێڕایەڵ و فەرمانبەر بوو، ئەوە ئەو میللەتە میللەتێکی پێکەوە گونجاو و دۆست و تەباو ڕێکوپێك لە نێو خۆیدا، وە لە بەرامبەر دوژمنان و ناحەزان و لە بەرامبەر (تحديات)ەکانیش دا تۆکمەو توندوتۆڵ و پێکەوە جۆشدراو دەبێت.

بەڵام میللەتێك کە شێرازەی ڕەو شتی دەپچڕێ و تووشی دارووخانی ئەخلاقی دەبێ، ئەوە بێگومان لە نێو خۆیدا گەندەڵ دەبی، وەك دار- درەختێك- ی کرمێ پێویستی بە کەس ناکات بیبڕێتەوەو هەر لە بەهانەیە بۆ پشووە بایەك کە بیخات، چونکە لەنێو خۆیدا گەندەڵ وکرمۆڵ بووە، بەڵێ ڕەوشتی نزم و نەمان و دارووخانی ڕەوشتی بەرزو جوان، میللەتان گەندەڵ و کرمۆڵ دەکات و لە بەیینیان دەبات.

ئینجا ئەگەر تەماشای قورئان بکەین دەبینین کە خوای پەروەردگار باسی هەموو شتێکی بۆ موسڵمانان کردوە، وە پێغەمبەری پێشەواش ﷺ ئەرك (وظيفة)ی هەر ئەوە بووە کە ئەوەی خوا فەرمویەتی بۆیان ڕوون بکاتەوە: ﴿ وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ (النحل – 44) واتە: ئەوەی کە بۆمان ناردۆتە خوارێ ئەی (محمد ﷺ) بۆیە ناردوومانە تاکو تۆ بۆ خەڵکی ڕۆشن بکەیتەوە، وە بەڵکو خۆشیان بیربکەنەوە .

هەم بە فەرمایشت و قسە موبارەکەکانی، هەم بەرەو شت و ڕەفتارو ئاکارو هەڵسوکەوتی، هەم بەدان پ یێداهێنان (تقر یر)ی کە لەبەرچاوی ئەو یان لای ئەو شتێك کراوە ئەویش لێی بێدەنگ بووە یاخود ڕەزامەندیی دەربڕیوە.

کەواتە پێغەمبەر ﷺ هەر ئەوە بووە کە ئەوەی خوا فەرموویەتی بۆ خەڵکی ڕۆشن بکاتەوە، بۆیە کاتێك پرسیار لە دایکی بڕواداران (عائیشة) -خوا لێی ڕازی بێت- کرا سەبارەت بە ڕەوشتی پێغەمبەر ﷺ لە وەڵامدا فەرمووی: (ألـ ست ت قرأ القران). ئایا قورئانت نەخوێندۆتەوە؟ گوتی: با، فەرمووی: (فان خلق رسول الله ﷺ كان القرآن) (رواه أحمد عن سعد بن هشام و رواه ا بن جرير و أبوداود والنسائي نحوه) بڕوانە(مختصر تفسير ابن كثير)ج3ص559

ڕەوشتی پێغەمبەری خوا ﷺ قورئان بوو.

کێ شایەتی بۆ پێغەمبەر ﷺ دەدات؟ خێزان- هاو سەر-ی کە هاوسەر لە هەموو کەس باشتر هاوسەری خۆی دەناسێ چونکە هەموو کاتێك لەگەڵی دایە.

بەڵێ ڕەوشتی پێغەمبەری خوا ﷺ قورئان بوو، قورئان چۆنی فەرمووە پێغەمبەر ﷺ بەو شێوەیە دەجووڵایەوەو هەڵسوکەوتی لەگەڵ هەموو خەڵکدا دەکرد.

جا ئەگەر تەماشای ئایەتەکانی قورئان بکەین لە چەندان شوێندا خوای کاربەجێ کە بەسەرهاتی میللەتانی پێشوومان بۆ

دەگێڕێتەوە ئەوەمان بۆ دەستنیشان دەکات کە خاڵی وەرچەرخانی بەرەو داڕووخانی میللەتان لە ڕەوشت نزمییەوە دەستی پێکردوە، بە تایبەتیش پەیوەندی نێوان ژن و پیاو- لایەنی جینسی-، کە مێژوونووسەکانیش هەموویان دان بەو ڕاستییەدا دە نێن، نەك تەنیا مێژوونووسە موسڵمانەکان، بەڵکو مێژووزا نە ب یانی و ناموسڵمانەکان بەر لە موسڵمانەکان، دانیان پێداناوەو بە درێژی باس دەکەن کە هۆی ڕووخانی شارستانەتی ئیغریقی یەکان چی بوو؟ وە هەروەها هی یۆنان و ڕۆم و فارس و هیند.. هتد[8]؟

هەموویان کات یێك ڕوو خاون کە گەی شتوونە لووت کەی خۆشگوزەرانی، وە گەیشتوونە پلەی هەرەنزمی کەڵك بینی نی خراپ لە ئافرەت و بەرهەڵدایی و بێ سەروبەرەیی جینسی، کە ئەوەش کاریگەرترین هۆکاری داڕووخانی ڕەوشتە!

خوای کاربەجێ ئافرەتی دروستکردوە کە بە ندە (ع بد)ێکی مێینەی خوایە وەك چۆن پ یاو بەندە یەکی نێرینە یە، ئەویش بەندەیەکی مێینەیە، وە هەرکام لە پیاو و ئافرەت خوای گەورە بۆ کۆ مەڵێك ئەرك (وظي فة) درو ستی کردوون، کۆ مەڵێك تایبەتمەندی فی طری و سرو شتی پێ بەخ شیون وکۆ مەڵێك

(8) بۆ وێنە(ویل دیورا نت) لە کتێبی ( قصة الحضارة)دا لە چەندان شوێندا ئاماژە بەو مەسەلەیە کردوە

ئەركیشی بۆ دیاری كردوون بە پێی ئەو تایبەتمەندییە سروشتییانەی خۆی لەسەری خولقاندوون.

جا هەركاتێك بەشەریەت پیاوەكانی و ئافرەتەكانی بەو شێوەیە بەڕێوە چووبن كە شەریعەت فەرمووییەتی و لە گەڵ سروشت (فیطرة)یاندا جووتە، ئەوە بەختەوەر بوونە، وە هەركاتێك لایاندا بێت كە بە زۆریش لادانەكە لەوەوە دەستی پێكردوە كە ئافرەت بۆتە ئامرازی پێ ڕابواردن، بۆتە بووكە شووشە، بۆتە پەشتەماڵ، بۆتە ئالەتێك كە سوودی خراپ (سوء الاستفادە)ی لێببینراوە، ئاخر ئافرەت ئەركی زۆر بەرزو پیرۆزی پێ سپێردراوە كە بریتییە لە ئەركی دایكایەتی، پەروەردەكردنی وەچە(جیل)ی داهاتوو، پێگەیاندنی پیاوان، پێگەیاندنی ژنانی داهاتوو، دروستكردنی كۆمەڵگا، دایك یەكەمین قوتابخانەیە، وە هەركاتێك لەو ئەركە سروشتییەی خۆی دوور خرایەوە ئەوە بە مەبەستی خراپ دوور دەخرێتەوە، بۆیە دوور ناخرێتەوە كە مافی پێ بدرێت، بە پێچەوانەوە بۆیە دوور دەخرێتەوە كە هەتك بكرێت و بێڕێز بكرێت، وە بۆ ئەوەی بكرێتە ئالەتێك و پێیەوە ڕابوێردرێت كە لە ڕاستیدا بە زەرەی تەواو دەبێت، ئەو دوورخستنەوەیە لەو ئەركە (وظیفة) سروشتییەی خۆی و لەو ئەركەی كە بە ئافرەت نەبێ ئەنجام نادرێ، كە هەم ئافرەتە كە خۆی زەرەر دەكات هەم كۆمەڵگایەكەش لە ئەنجامدا تووشی داڕووخان و زیان دەبێ، وەك

ئەوەی كە ئێستا لە ڕۆژ ئاوا دەب ینین، بێگو مان شتێكی زۆر ئاشكرایە كە ئێستا لە ڕۆژئاوا ئافرە تان ئەوا نەی كە تۆز ێك عەقڵیان هاتۆتەوە بەر خۆ یان وە پیاوەكانیش شیان داوا دە كەن و دەڵێن: با كارێك بكەین خێزان دروست بێتەوەو ئافرەت ئەركی سروشتی خۆی ببینێ، پیاو ئەركی سروشتی خۆی ببینێ، د یارە لە(شەریعەتی ئیسلامیی)ش دا ئافرەت ڕێگەی لێناگر ێت كە هەر چالاكی یەك ئەنجام بدات جیا لە ئەركی ماڵ و م نداڵ بە خێوكردن و دایكایەتی كردن، كە ئەركی سەرەكی خۆ یەتی سەرەڕای ئەو ئەركەش هەر ئەركێكی دی ببینێ لە بواری سیاسی، كۆمەلا یەتی، ئابووری، فیكری، فەر هەنگی.. شەرع ڕ ێی لێنەگرتوە، بەڵام بە ئادابی ئیسلامی یەوە، وە بە مەرجێك لەسەر حیسابی ئەركە سروشتی و سەرەكییەكەی خۆی نەبێت كە بەو نەبێ بە هیچكەس ئەنجام نادرێ.

ئێستا لە ئەورووپا- ڕۆژئاوا- خەڵك داوا دەكات كە ئافرەتەكان بگەڕێنەوە ماڵەكانی خۆیان، چونكە كۆمەڵگا هەمووی ز یانی لێكەوت، لە ئەورووپا لە ئەنجامی ئەوەدا كە هەم پ یاو هەم ئافرەت زۆر ئینحرافی كردوە لە مەسائیلی جینسی‌دا كراوە بە قانوون كە پیاو لەگەڵ پیاوێكدا خێزان دروست بكات، ئافرەتیش لەگەڵ ئافرەت!!

واتە: ئەوەی خوای باڵا دەست لە بەســەرهاتی گەلــی (لوط) -(علیە سلام- كە (نێربازی)یان كردوە باسی كردوە، كە شتێكی زۆر نزم و سەرشۆڕانەو زۆر خراپ و پیسە، ئەوە ئێستا لە ئەورووپا دەكرێ بە قانوون و لە پەرلەمانەكان‌دا بڕیاری لەسەر دەدرێت!

ئا ئەوەیە سەر ئەنجامی داڕووخانی خ ێزان و سەر ئەنجامی دەرچوون لە شیــرازەی شەریعەت و فیترەت.

خوای پەروەردگار دەفەرمویَ: ﴿ وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَرْ يَةٍ بَ طِرَتْ مَعِيشَتَهَا فَتِلْكَ مَسَاكِنُهُمْ لَمْ تُسْكَن مِّن بَعْدِهِمْ إِلا قَلِيلاً وَكُنَّا نَ حْنُ الْوَارِثِينَ﴾(القصص: 58)

واتە: چەند لە میللەتان و كۆمەڵگایەكانمان بنـ بـڕو قەلاَ چۆ كردوە دوای ئەوەی كە زۆر ڕوویان كردە خۆش گوزەرانی و ڕابواردن بەبی ڕەچاوكردنی ئاداب و سنورەكانی شەرع، دەجا ئەوە خانوو و بەرەكانیانە كە كەمێك نەبیَ خەڵكیان تێدا نیشتەجیَ نەبوو. وە ئێمە خۆمان بووینە میراتگریان.

ئەگەرنا دین پیێی خۆشە موسڵمان ژیانی خۆشگوزەران (مُرَفَّه) بیَ، بەلاّم نەك لەسەر حیسابی دین و ئەخلاق وە نەك بە پارەو ماڵی حەرامیش. هەروەها لە شوێنێكی دی كەدا دە فەرمویَ: ﴿وَإِذَا أَرَدْنَا أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا فَ حَقَّ عَلَيْ هَا الْقَوْلُ فَدَمَّرْنَاهَا تَدْمِيرًا ﴾ (الاسراء: 16)

واتە: هەركاتێك ویستمان شارو وڵاتێك (ئاوەدانی یەك) كاول بكەین فەرمان دەكەین بە خۆشگوزەرانەكانی(كە چاكە ب كەن)،

کەچی ئەوان خراپ دەکەن، جا فەرمانی خوا لەسەری دێتە دی و کاول و خاپووری دەکەین.

ئەم شارستانەتییەی ئێستای ڕۆژئاوا بە ئەمەریکایشەوە بە تەئکید ئەوە سەر ئەنجام و چارەنووسیەتی، بەڵام دیارە کە (مقومات)ی مانەوەی ماون، ئەگەرنا بەڕاستی ئەو فەسادە ئەخلاقی و ئەو پچرانەی شیرازەی خێزان و ئەو لێکهەڵوەشانەوەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، ئەو نەمانی سۆزو بەزەیی و پەرۆشە بەرامبەر یەکتر، ئەو نێربازیی و فەسادە ئەخلاقییەی کە لە ئەورووپا هەیە، کە وەك قانوونێك مامەڵە لەگەڵ ئەو دیاردە غەریبانەدا دەکرێ، ئەوە بەڕاستی هەمووی پێشەکی و زەمینە خۆشکەری ڕووخان وکۆتایی پێهاتنی ئەو شارستانەتییە ماددییە ئاژەڵیەن بە گوێرەی یاسا نەگۆڕەکان (السنن الثابتة)ی خوای دادگەر.

## خاڵی دووەم: بڕیاری شەریعەت سەبارەت بە چۆنیەتی پەیوەندیی جینسی نێوان پیاو و ئافرەت :

خوای پەروەردگار زۆر بە ڕاشکاوی ئەوەی فەرمووە کە: ﴿ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ الشَّهَوَاتِ مِنَ النِّسَاء وَالْبَنِينَ وَالْقَنَاطِيرِ الْمُقَنطَرَةِ مِنَ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ وَالْخَيْلِ الْمُسَوَّمَةِ وَالأَنْعَامِ وَالْحَرْثِ ذَلِكَ مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَاللّهُ عِندَهُ حُسْنُ الْمَآبِ﴾ (آل عمران -14)

واتە: خۆشەویستنی ئارەزووەکان لە ژنان و کوڕان وخەزێنەی زێڕو زیوی لەسەریەك کەڵەکە کراوو، ئەسپانی نیشانەدارکراو و ئاژەڵ وکشتوکاڵ بۆ خەڵکی ڕازێنراوەتەوە، ئەوەش ڕابواردن- یکی کورتی- ژیانی دنیایە، وە خوا چاکترین سەرەنجامی لەلایە.

وەك دەبینین خوای کاربەجێ بە ڕاشکاویی ڕایگەیاندوە کە ئەو شتانە سروشتی ئینسان حەزی لێیانەو خوازیاریانەو بۆیان تامەزرۆو عەودالە، جاجێی سەرنجە کە دەبینین خوای پەروەردگار ئافرەتی پێش هەموویان خستوە ﴿ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ الشَّهَوَاتِ مِنَ النِّسَاء ﴾ ئینجا ئایا کێ خۆشویستنی ئەو ئارەزووانەی بۆ جوان کردوون؟! دیارە خوای کاربەجێ و پەنهان بین، خوا وایکردوە کە پیاو حەزی لە ئافرەت بێت و مەیلی جینسی بۆی هەبێت ئافرەتیش بەهەمان شێوە لەگەڵ پیاودا وابێت، خوا وایکردوەو فیترەت و سروشتیی ئینسان وایەو خوای کاربەجێش ئینسانی لەسەر ئەو فیترەت و سروشتە خولقاندوە.

بەڵام شەریعەت دەفەرموێ: وەك چۆن ئینسان تینوو دەبێ بەڵام گەیشتە هەر ئاوێکی پیس نایخواتەوەو پێیدا نانووسێ! وە ئینسان برسی دەبێ بەڵام گەیشتە هەر شتێك نایخوات، بەڵکو تەماشا دەکات چ شتێك خاوێن و چاکە چ شتێك بەرژەوەندی دابین دەکات و لە قازانجی بەدەنی دایە ئەوە دەخوات و ئەوە دەخواتەوە.

وە ئینسان پێویستی بە بەرگ و پۆشاك هەیە بەڵام هەموو شتێك هەر لەبەر ناكات، بەڵكو پۆشاكێك كە لەگەڵ بەدەنیدا گونجاو بێت دەپۆشێ!

مەسەلەی جینسیش هەر بە هەمان شێوە، بەڵێ پیاو پێویستی بە ئافرەت هەیەو ئافرەت پێویستی بە پیاو هەیە، بەڵام شەرع دوای ئەوەی كەدانی بەوەدا هێناوە كە ئەوە شتێكی فیترییە وە شتێكی شەرعی یەو زۆر ڕەوایە وە هیچ شەرمی تێدا نیە، بەڵێ وێڕای ئەو دانپێداهێنانەی شەرع بە ڕەوایی و سروشتی بوونی ئەو غەریزەیەدا شەریعەتی خوا، هەم لە قورئاندا هەم لە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ دا ڕێنمایی موسڵمانانی كردوە كە چۆن چۆنی لەو بوارەدا هەڵسوكەوت بكەن، وە شەرعزانان (فقهاء) یش بە درێژی باسیان كردوە كە دەبێ پیاو چۆن ئافرەت بهێنێ و چۆن بە یەكەوە ڕەفتار بكەن و هەتا چۆنیەتی پێ كەوە جووت بوون (جماع)یش لە شەرعدا باسكراوە، وە خراوەتەڕوو كە چۆن مامەڵە لەگەڵ یەكتر بكەن و ڕەوشتیان لەگەڵ یەكتر چۆن بێ، ئەوانە هەر هەمووی بە ڕوونی و درێژی خراو نەڕوو، وەك لە كوردەوار یدا دەگوترێ: (لە شەرع دا شەرم نیە) واتە: لە ڕوونكردنەوەی شتی شەرعیدا پێویست بە شەرم ناكات.

لە(صحيح البخاري)دا هاتوە كە(عائشة) -خوای ل یی ڕازی بێت- لە مەدح و وەسفی ئافرەتە مەدینەییەكاندا گوتوو یەتی:

(رحم الله نساء الانصار لم يمنعهن الحياء أن يتفقهن في الدين)
واتە: خوا بەزەیی بە ئافرەتانی ئەنصاریدا بێتەوە شەرم (حیاء) قەدەغەی نەکردن لەوەی کە لە دینەکەیان دا شارەزابن.

دیارە ئافرەتانی ئەنصاری -خوا لێیان ڕازی بێ- دەهاتن جۆرەها پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەکرد لەو بوارانەدا.

بەڵێ موسڵمانینە! شەریعەتی تێرو تەواوی خوا دوای ئەوەی بە ڕوون و ڕاشکاوی دانی بە ڕەوایی غەریزەی جینسیدا هێناوە، هاتووە شێرازەو سنووری داناوە بۆ ئەو پەیوەندی یە جینسییەی کە دەبێ لە نێوان پیاو و ئافرەتدا هەبێت، بەڵێ شەریعەت دەڵێ:

یەکەم : دەبێ لەسەر بنچینەی شەرع، ئەو پیاوو ئافرەتە بۆ یەك بن، نەك بەرهەڵدایی (مشاعية)و (اباحية)ی جینسی کە ئەمڕۆ بەناو شارستانێتی[9] ڕۆژئاوا دەیەوێت ئەوە بەسەر دونیادا حاکم بکات، واتە بەرەڵایی و بێ سەرەوبەرەیی جینسی، کە خۆیان بەدەستی یەوە گیریان خواردوەو خۆیان پێی گەندەڵ و پووچەڵ بوون و دەیانەوێ خەڵکی دیکەش وەك خۆیان لێبکەن، وەك کەسێك کە گول و گەڕ دەبێ دەیەوێ خەڵکی تریش وەك خۆی لێبکەن، وەك گەلی (لوط)

(9) کە شارستانیەتێکی ماددی و ئاژەڵی یەو لەسەر بناغەی ماددی بوونی ژیان و ئاژەڵ بوونی ئینسان بنیات نراوە بۆیەش تەنها لەو دەروازەیەوە تەماشای هەموو شتێك دەکات.

پێغەمبەر(علیه الصلاة والسلام) کە (لوط- علیه الصلاة والسلام)و ئەو خەڵکە کەمەی کە ئیمانیان پێی هێنا بوو دوور بوون لە رەو شت نزمیی، پێیان ناخۆش بوو، وە دەیانویست وەك خۆیانیان لێبکەن، دەیانگوت: ﴿أَخْرِجُوا آلَ لُوطٍ مِّن قَرْيَتِكُمْ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ﴾ (النمل - 56). واتە (لوط علیه الصلاة والسلام)و دارو دەستەکەی لە وڵات و شارەکەتان دەربکەن ئەوانە کۆمەڵێکن دەیانەوێ پاك بن. واتە: لەگەڵ ئێمەی پیس ناگونجێن، جا یان دەبێ وەك خۆمان پیسیان بکەین، یان دەبێ دەریان بکەین!!

ئەمڕۆ شارستانێتی رۆژئاوا دەیەوێ ئەوە بە سەر دونیادا بسەپێنێ، دەڵێ: مادام بۆ خۆم بەو ئاگرەوە دەستم چزاوەو بۆ خۆم پووچەڵ و گەندەڵ بووم با (جیهانی ئیسلامی)یش وا لێکەم!!

بەڵێ شەریعەت دەفەرموێ: نا، دەبێ ئەو ئافرەتە وەك ئینســـــانێك و وەك کە لە شەخسییەتی دەوەشێتەوە بە هاوسەر بگیرێ و دەبێ بەرێزو حورمەتەوە پیاو بەچێ دا خوازیی ئافرەت بکات، بەڵام بەداخەوە هەندێك شت لە هەندێك رۆژنامەو گۆڤارو بڵاوکراوەدا دەخوێنینەوەو دەیبیستین زۆرمان پێ سەیرە، لە رووی شەرعییەوە، وێڕای ئەوە لەگەڵ ئاداب و دەستوور و داب و نەرێتی کوردەواریشماندا ناگونجێ!

لە یەکێك[10] لەو بڵاوکراوانەدا کە لە ژێر سایەی یەکێك لە دوو ئیدارە خۆماڵییەکەمانداو بە ڕەسمی دەردەچێ نووسراوە: ئایا چ دەبێ ئەگەر لەمەو دوا ئافرەتان بچن داخوازی پیاوان بکەن؟!

جا یەکێك لە گەنجەکان لە وەڵامدا گوتوویەتی: ئەگەر ئافرەتێك داخوازی من بکات دەڵێم: دەبێ سەیارەیەکم بۆ بکرێ، هەروەها یەکێکی دیکە شتێکی دیکەی لەو بابەتە دەڵێ و.. هتد!

بەڕاستی ئا ئەوە لە لایەکەوە ئینسان دێنێتە پێ کەنین کە عەقڵ و مستەوا بگاتە ئەو ڕاددەیە، ئینسان قسەی وا بکات! وە لە لایەکی دیکەشەوە بەزەیی و پەرۆشی دەجوولێنێ! چونکە بێگومان ئەوە پێچەوانەی فیترەت و سروشتەو، خوای کاربەجێ ئافرەتی وا خولقاندوە پێی خۆشە داخوازیکراو (مرغوب فیها)و داواکراو (مطلوب) بێت، ئەوە نەك هەر شەریعەت وای فەرموو بێت، بەڵکو بە درێژایی مێژوو هەموو شاعیرو سەرجەم ئەدیب و تێکرای نووسەرەکان، ئەوانەی کە وەك دەڵێن گیرۆدەی داوی (عیشق) بوونەو بە ئافرەتیان هەڵاگوتوە، پیاو بوونە! مەگەر چۆن دەنا هەر پیاو بە ئافرەت هەڵادەڵێ و، لە نێو هەموو میللەتاندا بە کافرو موسڵمانەوە عەیب بووە ئافرەت بە پیاو هەڵابڵێ، وە مەگەر چۆن، ئەگەرنا هەر پیاوە دەبێ (عاشق) بێ و ئافرەت

(10) کە بڵاوکراوەی (تایم) ە!

دەبێ (معشوق) بێ، هەر پ ـیاوە دە ـبێ داوا ـکار(طا ـلب) ـبێ، ئافرەتیش دەبێ داواکراو بێ!

بەڵێ خەڵك و میللەتانی بێ دین و دوور لە خوا لە ڕۆژ ـئاوا- ئەوروپاو ئەمەریکا- سروشت و میزاجیان تێک چووە، بۆ ـیە زۆر جاران ئەو مەسەلەیە بەراوەژوو بۆتەوە! نەك هەر ئەوەندە، ب ـگرە ئەوەندە لە فیترەت هەڵگەڕاو ـنەوەو ـبەرەو ـئاژەڵێتی سەرەوژێر بوونەوە، دەڵێن: زۆر لایان ئاساییەو کابرا هیچ بەوە قەڵس نیە کە دەبینێ ئەوە زرتە زەلام ـێك ـبە شێوەیەکی نا شیرین لە ـگەڵ کچەکەیەتی!! بەڵکو جاری وایە لەگەڵ هاوسەرەکەیشی بێت زۆر پێی قەڵس نیە، دیارە ئەوانە بە هۆی بێ دینییەوە هیچ غیرەت و شەهامەتیان نەماوە!، جا بێگو ـمان ـئەوە سرو شت- ـفیترەت- تێکچوونە، وەك چۆن کابرایەك کە نەخۆش دەبێت ـئاوی شیرین دەخواتەوە بەدەمی تاڵە، بەڵام ڕەنگە شتێکی تام ناخۆش بخوات زۆر پێی خۆش بێت، دەڵێن، قالۆنچەش بە بۆنی عەترو گوڵاو گێژ دەبێ بەڵام بە بۆنی ڕیخ و شیاکە خۆ شحاڵ دە ـبێ، بۆ ـیە ـخڕی دەکاتەوەو دەیکاتە تۆپ و لەگەڵیدا خەریکە.

بەڵێ ئەوە میزاج تێکچوونەو ماقوولێش نیە حاڵەتی نەخۆشیی و تێکچوون بکرێتە بناغەی ق ـیاس، ـئەوە ـفیترەت تێک چوونەو سەرگەردانی و ڕێ لـێ بزر بوونەو ناگونجێ بکرێ ـتە دە ستوورو قانوون، ناکرێ ئێمە تەقلیدی بکەین و تەماشای بکەین.

خەڵکێکی نەخۆش و بێ هۆش تووشی دەردێکی کوشندە بوون، بۆچی لاسایان بکەینەوەو تەماشایان بکەین؟ ئەی بۆچی ئەوان تەماشای ئێمە نەکەن؟

بۆ ئێمە کارێکی وانەکەین کە ئێمە ببینە جێی تەماشاو سەرنجی خەڵك؟! بۆ ئەوەی ئەوان فیترەتی تێکچووی خۆیان بە پێی تەرازووی شەریعەتی ئێمە ڕاست بکەنەوە، نەك ئێمە فیترەتی پاکی خۆمان وەزعی باشی خۆمان وەك هی ئەوان لارو خوار بکەین، با ئەوان لارییەکەی خۆیان وەك شەریعەتی ڕاست و حاڵەتی شەرعیی و ڕاستیی ئێمە ڕاست بکەنەوە!

بە پەسەندی دەزانم لێرەدا بە سەرهاتێکی جێی پەندو عیبرەتتان بۆ بگێڕمەوە، لە کتێبی: (المرأة بين طغيان النظام الغربي و لطائف التشريع الرباني- د.محمد سعيد رمضان البوطي-ص 139) دا ئەم ڕووداوەی گێڕاوەتەوەو دەڵێ: (خزمێکم ئافرەتێکی ئەمەریکی هێنا بوو ڕۆژێك بەسەردانمان هاتبۆوە کە دیارە لەوێ ئافرەتەکەئەوی خواستوە[11] بە نرخێکی زۆریش، چونکە وا دیارە لەوێ یان ئافرەت زۆرن، یان پیاو بێ منەتە لە

(11) وەك ئەوەی کە ئەو گۆڤارە نووسیووبەتی و دەیانەوێ لێرەش وای لێبێت و ئافرەتی کوردیش وەك هی ڕۆژئاوایی کلۆل و بێ حورمەت بێت و بە پارە و تەکلیف مێردی چنگ بکەوێ و لە تەڵەو داوی نامەردان بکەوێ!

ئافرەت و ئافرەتە کە نا چارە بێ خوازێ[12] دە لێ: ئافرە تە ئەمەریکییەکە کە هاتەوە تەماشای کرد لای ئێ مە پارەی زۆر دەدرێ لە مارەیی ئافرەتداو پاشان ڕیش سپی و پ یاو ماقووڵ کۆدەکرێ نەوەو چەندجار تەکلیف دەکر ێت و زۆر بەگران و سەنگینی و بە نرخ و ڕێزێکی زۆرەوە ئەو ئافرە تە دە خوازرێ و مەرج لەسەر پیاو دادەنرێت و.. هتد.

ئافرەتەکە کە زانی وایە سەری بردە بن گوێی مێردەکەی و پێی گوت: بۆ خاتری خوا با نەزانن کە من تۆم خواستوە ئەگەرنا لێرە حەیام دەچێ، دیارە لێرە ئافرەت زۆر بەڕێزو بە نرخ و بەهایە بەڵام لای ئێمە زۆر سووکە بۆ خاتری خوا با ئەو مە سەلەیە نەزانن. دەڵێ: مێردەکەیشی پێی گوت: نا خەمت نەبێ پێیان ناڵێم).

کەچی ئەوانە دەیانەوێ وامان لێبکەن، ئافرە تە بەڕێزەکانمان ئاوایان لێبێت، بەڕاستی ئەوە خزمەت و دڵسۆزی ن یە بۆ ئەو خەڵك و میللەتە، ئەوە دڵسۆزی نیە بۆ ئەو ئافرەتە موسڵمانە کە وەك ئافرەتە کلۆڵ و داماوەکانی ڕۆژئاوایان لـێ بێت.

<u>دووەم</u> : ئینجا شەریعەت دوای ئەوەی بڕیاری داوەو وای داناوە کە بەو شێوەیەو لەسەر بنچینەیەکی ڕوون و ئا شکراو زۆر ڕ ێز لێگیراوانە ئەو پەیوەندییە لەگەڵ ئافرەتدا دروست بکر ێت و

(12) دیارە لە کۆمەڵگایەکی موسڵمان دا بە هیچ هۆکارێك ئافرەت نا چاری ئەوە ناکرێ و عەقیدەو پەروەردەی ئیسلامیی و ئادابە شەرعیی یەکانی حورمەت و ڕێزی دەپارێزن .

ژیانی هاوسەرێتی بنیات بنرێت، بۆ ئەوەی کە گوناح و تاوان دروست نەبێت، لە پێشدا وەك پەرژین کردن و رێلێگرتنێکی دوور دیاری کردوە کە لە کاتی سەردان و هامو شۆی مالّی یەکتردا پێویستە بەبێ ئیزن وەرگرتن کەس نە چێتە مالّی کەس وەك خوا (جلّ جلاله) فەرموویەتی: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَدْخُلُوا بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّى تَسْتَأْنِسُوا وَتُسَلِّمُوا عَلَى أَهْلِهَا ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾ (النور -27) واتە: ئەی ئەوانەی کە ئیمانتان هێناوە مەچنە مالّی یەکتر تاکو نەزانن کە مەجال هەیە وە تاکو ئیزن وەر نەگرن وە سەلام لە خاوەنەکەی نەکەن.

بەلّێ خوشك و برایانی موسلّمانم! یەکەمین پەرژین و پارێزەری نامووس و ئەدەب و ئەخلاق لە ڕووی جینسییەوە ئەوەیە کە خەلّکی یەکسەر خۆیان بە مالّی یەکتردا نەکەن! بەلّکو سەلامیان لێبکەو ئیزن وەربگرن ئەنجار بچن، نەبادا کتوپڕ لێیان وەژوور بکەون و چاویان بە عەیب و عەورەتیان بکەوێ!

<u>سێیەم:</u> پاشان شەریعەتی خوا ڕوانینی حەرامی پیاوو ئافرەتی بۆ یەکتری قەدەغە کردوە، وە دەفەرموێ : ﴿ قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَلِكَ أَزْكَى لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ ، وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ ﴾ (النور:30-31).

چونکە لە ڕوانینی حەڕام و لە تەما شاکردنی ئارەزووبازا نەوە شتی تریش پەیدا دەبێت، وەك شاعیری ناوداری بە ڕەچەڵەك کورد (احمد شوقی) دەڵێ: (نظرة فابتسامة فسلام فكلام فموعد فلقاء)[13]. بەڵــێ لە ڕوانینی حەرا مەوە داوێنپیسی درو ست دەبێ، بۆیە شەریعەت هەر لە دوورەوە ڕێی لێگرتوەو پەرژینی بۆ داناوە.

**چوارەم:** ئەو جار شەریعەت پێویستی کردوە کە ئافرەت جوانی خۆی بۆ خەڵکی نامەحرەم دەرنەخات مەگەر ئەوەی کە بەنا چاری دەردە کەوێت(ولا يبدين زينتهن الا ما ظهر منها)(النور: من الاية 31) واتە: با جوانیی خۆیان پێ شان نەدەن مەگەر ئەوەی کە بۆ خۆی (لە حاڵی عیبادەتدا یان بە عادەت)[14] دەردەکەوێت.

کە زۆربەی هەرە زۆری توێژەوەوان قورئان و فەرمایشناســـان و

(13) واتە: تەماشاکردنێك، زەردەخەنەیەك، سڵاوکردنێك، قسەو باسێك، جێ ژوان دانانێك، بە یەکگەیشتنێك !

(14) کە مەبەست پێی دەم و چاوو هەردووك دەستە تا مەچەك وەك (القرطبي) گوتوویەتی بڕوانە (الجامع لاحكام القران) ج 6 ص 3556، کە گوتوویەتی: (اى ما يظهر منها عادة وعبادة).

شەرعزانان دەڵێن[15]: (الا ما ظهر منها) واتە: دەمو چاو و هەردوو دەست هەتا مەچەك. چونكە هەم لە حاڵەتی عیبادەتدا فەرزەو دەبێ ئەو دووانە دیار بن وەك لە نوێژو حەجدا، وە هەم وەك عادەتیش ئافرەت ئەگەر دەموچاوی دیار نەبێ و دەستی دیار نەبن زۆر جۆرە كارو چالاكی بۆ ئەنجام نادرێت، بۆیە ئافرەت بۆی هەیە دەموچاو و دەستی دیار بێت، بەڵام لەسەری واجب نیە دیار بێت هەروەك لەسەریشی واجب نیە دایپۆشێ، واتە پەچە(نقاب) گرتنەوە لەسەر ئافرەت واجب نیە لەسەر ڕای زۆربەی (جمهور)ی زانایان، هەندێكیش دەڵێن لەسەری فەرزە كە ڕووی و هەردووك دەستەكانیشی وەك باقی جەستەی دابپۆشێ بە تایبەتی كاتێك كە مەترسیی هەبێ تەماشا بكرێ بە شێوەیەكی ئارەزووانەوە، بەڵام ڕایەكەیان بێهێزە وەك لە كتێبی (ئافرەت و خێزان لە سایەی شەریعەتدا) سەلماندوومانە.

<u>پێنجەم:</u> هەروەها شەریعەتی وردبین و دووربینی خوای كاربەجێ بێجگە لەو حەسارو دیوارو پەرژینانەی كە ڕابردن، حەسارو پەرژینێكی دیكەی داناوە بۆ ڕێ بەستن و بوار نەدان بۆ

---

(15) هەروەك لە كتێبی (ئافرەت و خێزان لە سایەی شەریعەتدا) ئەم باسەم هێناوەو جوان (تحقیق)م كردوەو بە درێژی بەڵگەكانم خستۆتەڕوو وە موناقەشەیەكی وردی ڕایەكەی دیكەم كردەوە كە پێی وایە دەست و دەموچاویش عەورەتەو پێویستە دابپۆشرێن، وە بڕوانە كتێبی (جلباب المرأه المسلمه)ی شێخ ئەلبانی.

سەرهەڵدانی گو ناح و تاوانی جین سی کە بریتیە لە قەدەغەکردنی لە شوێنی چۆڵ و بە تەنها پێکەوە بوونی پیاو و ئافرەتێکی نامەحرەم، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (لايخلون أحدكم بامراة الا مع محرم) (متفق عليه عن ابن عباس رضى الله عنهما).

واتە: نابێ و قەدەغەیە کە یەکێکتان بە تەنهاو لە شوێنێکی چۆڵ لەگەڵ ئافرەتێکدا بێت، مەگەر مەحرەمێکی لەگەڵ بێت.

هەروەها فەرموویەتی: (أياكم والدخول على الن ساء، ف قال رجل من الانصار: أفرأيت الحمو؟! قال: الحمو: الموت) (متفق عليه)، واتە: خۆتان بپارێزن لە وەژوورکەوتن لە ئافرەتان- لە کاتێ کدا کە بە تەنهان- پیاوێکی ئەنصاری گوتی: ئەدی ئەگەر پیاوە کە خزمی مێردەکە بوو؟! فەرمووی: ئەوە خراپتریشە، (النووی) لە بارەی وشەی (الحمو)ە وە گوتوویەتی: (هو قريب الزوج كالأخ و ابن الأخ ونحوهما) واتە: بریتیە لە خزمی مێرد وەك برای و برازای و وێنەی وان.

## خاڵی سێیەم: حیکمەتی بەرگ و پۆشاکی شەرعییانەی ئافرەت:

زۆرجار خەڵکی عەلمانی بە پیاو و ئافرەتیانەوە ڕەخنە دەگرن لە بەرگ و پۆشاکی ئافرەتانی ئیسلامیی و دە ڵێن: خۆ بەرگ و

پۆشاك (حیجاب)[16] بەم شێوەیەی کە هەیە قەدەغەی ئینسان ناکات لە گوناح و گرنگ ئەوەیە کە ئینسان خۆی پاك بێت و ئاواو ئاوا.. هتد.

جا ئێمەش دەڵێین: هیچ کەس نەیگوتوە کە بەرگ بە تەنها ئینسان باش دەکات! هەروەك ناڵێین: تەنها بەرگ و پۆشاکی ناشەرعیی ئینسان خراپ دەکات!

وە ئێمە ناڵێین: هەر ئافرەتێك بەرگ و پۆشاکی ئیسلامیی لەبەر نەبوو حەتمەن داوێن پیسە، نەخێر وا ناڵێین، بەڵام دەڵێین بەرگ و پۆشاکی ئیسلامیی و شەرعی بۆ ئافرەتان یەکێکە لەو شتانەی کە لەسەر ئافرەتی موسڵمان پێویستن، ئەگەرنا بەرگ و پۆشاکی شەرعییانە پۆشین، بریتی نیە لە تەنها واجبێك لە سەر ئافرەت، وە لە ڕاستیدا دەبێ ئیمان و عەقیدە وا لە ئافرەت بکات، پەروەردەی ئیسلامی و عیبادەتی بۆ خواو، بڕواو

---

(16) لە ڕاستی دا پۆشاکی ئافرەت (لباس المرأه) لەگەڵ (حجاب) کە بریتیە لە پەردە (ستر)، لەیەك جیان و لەسەر ڕای زۆربەی زانایان(حجاب) تایبەتە بە هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەرەوە ولەسەر ئافرەتانی دیکە فەرز نەکراوە، و شەی (حجاب)یش لە ئایەتی ژمارە(53)ی (الاحزاب) دا هاتوە، کە دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعًا فَاسْأَلُوهُنَّ مِن وَرَاءِ حِجَابٍ﴾ واتە : وە ئەگەر حەواج و پێویستی یەکان لێیان خواست (واتە لە هاوسەرانی پێغەمبەر خوا لێیان ڕازی بێ) لە پشت پەردەوە لێیان داوا بکەن.

بەڵام ئێستا زۆر کەس بە هەڵە وشەی(حجاب) بۆ بەرگ و پۆشاکی ئافرەت بەکار دێنێ کە لە ڕاستی دا وانیە.

قەناعەتی بەوە کە خوا ئەوەی حەرام کردوە کە ئافرەتان جوانی ی خۆیان دەربخەن، دەبێ ئا ئەوانە پاڵ بە ئافرەتەوە بنێن کە خۆی داپۆشێت، ئەگەرنا ئەگەر وەك چاولێکردن (تقلید)و لە بەر خاتری باب و دایك و ئەوانە بەرگە کەی بپۆ شێ، دوا یی کە فشارەکەی لەسەر نەماو لەو واقیعە چۆوە دەرێ بەرگە کەی دادەنێ، کەواتە: بەرگ و پۆشاکی ڕووت بۆ دونیا هیچ بە کەڵك نایەت و بۆ دوارۆژیش هیچ پاداشتی نابێ.

بەڵێ بەرگ و پۆ شاکی ئافرەت یەکێ کە لەو ئادا بە ئیسلامییانەی کە شەرع لەسەر ئافرەتی پێویست کردوون، وە لە ڕاستیشدا کاریگەریی بەرگ و پۆشاکیش لە ڕێ لێگرتنی گوناح و تاوان و پارا ستنی ئافرە تدا کەم نییە، بەڕا ستی پۆ شاکی شەرعییانەی ئافرەت وەك پەرژینێ کە بۆ باخ، وەك شوورەو حەسارێکە بۆ ماڵ- خانوو-، بە بەڵگەی ئەوە کە خوای کاربەجێ مەگەر چۆن دە نا هەر حوکمێکی شەرعیی فەرموو بێت حیکمەتەکەیشی لەگەڵ ڕوون کردۆ تەوە، بۆ وێنە: دەر بارەی بالاپۆش (جِلْباب) دەفەرموێ: ﴿ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاء الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ ذَلِكَ أَدْنَى أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾(الاحزاب - 59).

واتە: ئەی پێغەمبەرﷺ بە هاو سەرەکانت و ک چەکانت و ئافرەتانی موسڵمان بفەرموو با بالاپۆش(چار شێو)ەکانیان لە

خۆیان نیزیك بخەنەوەو خۆیانی پێ داپۆشن، ئەوە نزیکتــرو چاکترە بۆ ناسرانیان و ئازار نەدرانیان، وە بێگومان خوا لێ ـبوردەی ـبە بەزەیی یە.

سەبارەت بە(جلباب) زۆربەی زانایان دەڵێن: بەرگێکە کە ـلە سەرووی پۆشاکی عادەتی لەبەر دەکرێت ـبۆ دەرەوەی ـماڵ ـکە سەرتاپای بەدەنی ئافرەت دابگرێت جگە لە دەموچاو و دە ستی، کە لە سەری فەرز نیە دایانپۆشێ، ئەگەرنا ئە ـگەر دەمو ـچاو و دەستیشی داپۆشێ شتێکی باشە، بە تایبەتی لە کاتی مەترسیی تەماشاکردنی ئارەزووبازانەدا، بەڵام لەسەری واجب نیە، بۆیە ـبە پیاوان دەفەرموێ: بۆ ئافرەتان مەڕوانن و(نظر) مەکەن، ـچونکە ئافرەت بۆی هەیە دەموچاو و دەستی دیار بێت، هەر بۆیەش ـبە ئافرەتانیش دەفەرموێ: بۆ پیاوان ـمەڕوانن و(ن ظر) مە ـکەن، چونکە پیاویش بۆی هەیە دەموچاو و دەستی دیار بێت!

جا (جلباب) هەر بەرگێکە کە:

1- جگە لە دەموچاو و دەست هەموو بەدەنی ئافرەت داپۆشێت.

2- وە تەسك نەبێت، کە ئەندامەکانی وەسف بکات و بەرجەستە بکات.

3- هەروەها ئەستووربێ و تەنك نەبێت.

4- وە زەرق و برق و سەرنج ڕاکێش نەبێت.

5- وە بەرگ و پۆشاکی کافران نەبێت واتە لاساکردنەوەی ئەوان نەبێت.

6- وە بەرگ و پۆشاکی پیاوا نە نەبێت و خۆی بە پیاوان نەشوبهێنێ.

7- وە(لباس الشهرة)[17] نەبێت.

8- وە بۆن خۆشکراو نەبێت.

جا خوای کاربەجێ لە ڕوونکردنەوەی حیکمەتی ئەو بەرگە شەرعییەدا دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ (الأحزاب-59) واتە ئەوە نزیکترە لەوەی کە: بناسرێن وە ئازار نەدرێن،(بناسرێن) یانی چی؟

ئافرەتێکی پۆشتەو پەرداخ و بە حەیاو حەشمەت کە بەرگ و پۆشاکێکی شەرعیی لەبەردایە کاتێك بە ڕێدا دەڕوات ئەو ئافرەتە وەك ئینسانێك دێتە بەر چاو و بە زمانی حاڵ بە دەوروبەرەکەی دەڵێ: وەك ئینسان لەگەڵ مندا مامەڵە بکەن، بەڵام ئایا ئافرەتێك کە ئەو بەرگ و پۆشاکە سەیرو نامۆیانەی کە لە ڕۆژئاواوە هاتوون کە هیچ پەیوەندی یان نە بە دینەوە هەیە نە

---

(17) زانایان لە بارەی پێناسەی(لباس الشهرة) وە چەند شتێکیان گوتووە، لە هەموو پێناسەکانیش باشتر ئەوە یە، کە بریتییە لە هەر جۆرە بەرگ و پۆشاکێك کە لەبەر قیمەت گرانی یان هەرزانیی ، یان سەیر و سەمەرەیی، خاوەنەکەی ببێتە جێی سەرنج و تێوەڕامانی خەڵك و سەرەنجام بەو بەرگەیەوە بناسرێ و ناوبانگ و شۆرەت پەیدا بکات.

بە داب و نەریتی کوردەواری، بە تایبەت ئەو بەرگە سەیرانەی کە بە بەدەنەوە چەسپ دەبن یان زۆر تەنکن، ئایا هەر ئافرەتێك ئەو جۆرە بەرگە لەبەر بکات بە زمانی حاڵ بە خەڵك ناڵێ: تەماشام بکەن بزانن بەدەنم چۆنەو ئەها فلان ئەندا مەم ئاوا یە...؟! بێگومان بە زمانی حاڵ بە خەڵك دەڵێ تەماشام بکەن و سەرنجم بدەن بۆیە خوای بەرزو مەزن دەفەرموی﴿ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ کەواتە ئەو بەرگ و پۆشاکە ئیسلامی یە نزیکترە لەوەی کە ئەو ئافرەتانە بنا سرێن، نەك بناسرێن داخوا کێن بە شەخسی، نا بەڵکو بناسرێن کە ئەهلی تەقواو ئەخلاقن، ئەهلی ئەدەب و حەیاو حەشمەتن، ئافرەتانێك کە مێیایەتی (أنوثة)ی خۆیان دەرنەخستوە، مێنایەتیی خۆیان بەرجەستە نەکردوە، بەڵکو ئینسانەتی خۆیان دەرخستوە، بۆیە چاوەڕوان دەکەن لە کۆمەڵگاش کە وەك ئینسان لەگەڵیاندا ڕەفتار بکات نەك وەك مێینە!!

ئەوە حیکمەتی ئەو بەرگ و پۆشاکەیە کە شەریعەتی خوا بۆ ئافرەتی دیاری کردوە، کە سەراپا ڕێزو حورمەت و قەدری ئافرەتەو هیچ جۆرە ئیهانەو سووك تەماشا کردنێکی تێدا نیە، بەڵکو بە پێچەوانەوە بۆ ئەوەیە کە کەس مەجال و دەرفەتی نەبێ و بیانووی دەست نەکەوێ بە چاوی تەماعەوە تەماشای ئەو ئافرەتە بکات یاخود قسەیەکی لەگەڵدا بکات کە لە گەڵ ئەو شەخسیەتە

پۆشتەو پەرداخ و داپۆشراوە كە لە خۆیەوە دیارە ئەو ئافرەتە ئافرەتێكە خاوەنی ئابڕوو و كەرامەت و كەسایەتیی خۆیەتی، نەگونجێ و شایستەی نەبێ!

واتە: هەروەك چۆن بابایەك كە بە تەنگ باخ و بێستان و گوڵزارو باخچەیەكەوەیە، دێنێ پەرژینی دەكات یان پاسەوان و ئێشكچی بۆ دادەنێ، تاكو زەرِ نەكرێ و مالآت وئاژەلی بەرهەلداو بێ خاوەن نەچنە نێوی و زیانی پێ نەگەیەنن و لق و پۆپەكانی نەشكێنن و میوەكانی هەلنەوەرێنن و گوڵەكانی هەلنەپسێنن!

شەریعەتی بێ هەلەوپەلەو تێرو تەواوی خوای كاربەجێ و میهرەبانیش بە هەمان شێوەو زیاترو چاكتریش لە سۆنگەی ئەوەوە كە پەرۆشی ئافرەتیەتی و بەزەیی پێیدا دێتەوەو بە تەنگیەوەیە كۆمەڵێك شوورەو پەرژینی بۆ پاراستنی كەرامەت و كەسایەتی داناوە، كە یەكیان بەرگ و پۆشاكی شەرعییەو ئەوانی دیكەش پێشتر ئاماژەمان پێیان كرد.

## خاڵی چوارەم: واقیعی میللەت و كۆمەڵگاكەمان لەو ڕووەوە چۆن دەبینین و كێ لێی بەرپرسیارە؟!

ئێمە ئەگەر تەماشای واقیعی ئەم میللەتەی خۆمان بكەین دیارە ئەم میللەتەی ئێمە وەك زۆر جار گوتوومانە من بە مەزلوومترین میللەتانی دونیای دادەنێم چونكە پێم وانیە هیچ

میللەتێك هەبێت ژمارەی بە ئەندازەی میللەتی کورد بێت (30-40)ملیۆن و هەتا ئێستا کیانێکی دان پێداهێنراوو لێ‌سەلمێنراوی نەبێت؟! واتە: قەوارەو کیانێکی سیاسی خۆی.

میللەتی ئێمە میللەتێکی مەزڵوومە، وە بەڕاستی بێجگە لە خوای پەروەردگار، وە پاشان مەگەر خۆی دڵ سۆزی خۆی بێ ئەگەرنا هیچ کەس دڵسۆزی نیە، ئەوەی کە ئەمڕۆ لە کورد دێتە پێشی‌ی دە لێی دڵ سۆزتم، ڕا ست نا کات، بەڵکو دڵ سۆزی بەرژەوەندییەکانی خۆیەتی، کاتی خۆی هەر ئەوان کورد ستانیان بەشبەش کردوە، جا ئەگەر ڕاست دەکەن دڵسۆزمانن، باوەك چۆن کاتی خۆی کوردستانیان لەتو پەت کردوە بە پێی پەیمانی (سایکس بیکۆ)و بە نێو خۆیاندا بە شێویانەتەوە وەك میراتی پیاوێکی مردوو، خۆ ئێستا بڕیارەکە هەر بەدەستی خۆیانە، هەر ئەو پەرلەمانانەی ئێستا هەن، هەر لەو پەرلەماناندا بڕیاری دابەشکرانی کوردستان دراوە، دەبا ئێستا بڕیارێك بدەن کە بەلای کەمەوە ئێرە ئەم بەشە کوردستانەی سەر بە عێراق با کیان و قەوارەیەکی سیاسی هەبێت و دانی پێدا بهێندرێت، بەلام ئێستاشی لەگەڵدا بێت هەر دەڵێن: (باکووری عێراق) لە زاریانڕا نایەت بڵێن کوردستانی عێراق !!.

میللەتی ئێمە میللەتێکی مەزڵوومەو لە ڕاستیدا کەساس و بێ کەسە، ئەگەر خۆمان دڵسۆزی نەبین کەس دڵسۆزمان نیە، وە

دڵسۆزییمان بۆ خۆمان لەوەدا دەردەکەوێ کە چەندە دڵسۆزین بۆ دینەکەمان، بۆ ئەو شەریعەتەی کە بە پابەندیی بەو شەریعەتەوە بووینەتە موسڵمان، وە بە پابەندیی بەو شەریعەتەوە بووین و دەبینە ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ وە بە تەئکید بەختەوەریی و سەرفرازیی دنیاو دوارۆژمان مسۆگەر دەبێ.

جا ئەگەر ڕاستە موسڵمانین، ئەگەر ڕاستە خۆمان بە بەشێك لە ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ دەزانین، دەبێ پێش هەموو شتێك و پێش هەموو کەسێك بۆ شەریعەتی خوا بۆ دینی خوای پەروەردگار دڵسۆز بین.

ئینجا ئایا ئێمە لە واقیعی ئێستای کوردستاندا بە گشتی چی دەبینین؟! ئەگەر تەماشای واقیعی خۆمان بکەین- هەڵبەتە جیا لە خوشکان و دایکانێك کە خوا پێداون و هیدایەت دراون و ڕوو لە خوان- ئەوەی دیکە چی دەبینین؟! لاساکردنەوەیەکی زۆر بێتامی مۆدیلاتی ڕۆژئاوا، لاساکردنەوەیەکی زۆر بێمانای ئەو جلوبەرگ و پۆشاك و داب و ڕێ و ڕەسمەی کە لە ڕۆژئاواوە دێت، دیارە ئافرەتان وان گەنجان بە کوڕو کچەوە وان، بگرە بەداخەوە زۆر لەوانەش کە کار بەدەستن هەروەها! هەڵبەتە من ناڵێم هەموویان چونکە من لەگەڵ هەندێکیاندا قسە دەکەم زۆر قەڵسن بەم وەزعە، ئەوانیش دەزانن کە ئەو(تونێل)ەی ئێمە گەیشتووینە دەروازەکەی دەزانن کۆتاییەکەی چۆن دێت!، بە تایبەتی ئەو

برادەرانەی كە بەرپرسن و ماڵەكانیان لە ئەوروپایەو بە چاوی خۆیان ئەوروپایان بینیوە، دەزانن لەوێ بێ ئەخلاقی و فەسادی ئەخلاقی و داڕووخانی ئەخلاقی چی بەو كۆمەڵگایانەی ئەوێ كردوە؟، بەڵێ جا ئەوانیش مەرج نیە هەموویان ئەو وەزعەیان پێ خۆش بێ، بەڵام بەداخەوە زۆریان هەن كە بە ڕاستی دەست لە پشتی ئەو كوڕو كچانە دەدەن كە چاویان لەبەر هەڵدایی و لە فەسادی ئەخلاقییەوە ڕێیان بۆ خۆش دەكەن و هانیان دەدەن، كە ئەوە بە هیچ پێوادانگێك نە موسڵمانەتی تێدا دەخوێندرێتەوە نە كوردایەتی و نە نەتەوەپەروەریی و میللەت دۆستیی!

چونكە میللەتێك ئەخلاقی نەماو فەسادی جینسی تێدا بڵاوبۆوە میللەتێك ڕەوشتی بەرزو جوانی تێدا ڕوو خا، ئەو میللەتە پێویستی بە كەس ناكات بیچەوسێنێتەوەو بیڕووخێنێ، بەڵكو بۆ خۆی ڕووخاوە بۆ خۆی گەندەڵ بووەو كرمۆڵ بووە!

بە داخەوە كە ئێمە لە گۆڤارو ڕۆژنامەو بڵاوكراوەكان و لە كەناڵە ڕادیۆیی و تەلەفزیۆنییەكان و كۆڕ و سیمینارەكان بانگەشەو پڕوپاكەندەی زۆر خراپ دەبیستین بۆ ئەوەكە ئافرەتان و كوڕو گەنجەكانمان شەرم و حەیایان لە بەردەمدا نەمێنێ!، بۆ نموونە: كابرایەكی گۆرانی بێژی ڕەوشت نزم، كابرایەكی خۆ لێونبووی دۆڕاو، چەند ساڵێك چووە لە ئەوروپا بووەو هاتۆتەوە لەسەر ئاستی ڕەسمی و لەسەر ئاستی بەرز پێشوازی لێدەكرێ و

زەمینەی بۆ خۆش دەکرێ و کوڕو کچی ئەو میللەتەی بۆ تێ کەڵ دەکرێ، وەك مەڕو بەران بۆی تێکەڵ دەکرێن و دوا ییش کارە باو چراشیان لەسەر دەکوژێتەوە بۆ ئەوەی چ لە یەکتر دەکەن بیکەن، ئەوە کەی لە بەرژەوەندیی کورددایە؟! دین با لە ئەولا بێت، خۆ ئەوە بە پ ێودانگی کوردا یەتیش و وەك داب و نەریتی کوردایەتیش هەر شتێکی خراپەو هەر نزمیی و پەستی یە!

بەڕاستی من زۆرم لا سەیرە خەڵکی سلێمانی دەڵێن: ئەم شارە شاری شێخ مەحموودی حەفیـــــــدە، شاری کاك ئەحمەدی شێخە - ڕەحمەتی خوایان لەسەربێ -، دیارە ئەوانەو هاو وێنانیان پیاوی گەورەو چاك بوون، وە خەڵکی هەولێر دەڵێن: ئەم شارە شاری قەڵاو منارەیەو شاری فڵانە مامۆستاو زانای پایە بەرزو فیسارە کەسایەتی گەورەیە، ئایا لە کاك ئەحمەدی شێخ و لە شێخ مەحموودو گەورە پیاوان و زانایان (علماء)ێك کە لە سلێمانی و لە هەولێرو دەڤەری بادیناندا بوو ون ئا ئەو ڕەوشت نزمی‌یە کە بەردراوەتێ کە زەمینەی بۆ خۆش دەکرێ، کە خەڵکی بۆ هان دەدرێ، بە میرات گیراوەو بە جێماوە! وە ئایا ئەو ڕەوشت نزمی یە شایستەی ئەو میللەتەیە؟! شایستەی ئەو ڕێبازو ڕێ و شوێنەیە کە ئەو گەورە پیاوانە بە جێیان هێشتوە؟!

پاشان چۆن دەتوانین بڵێین ئێمە ڕێزمان هەیە بۆ کاك ئەحمەدی شێخ و شێخ مەحموودو بۆ ئەو گەورە پیاوانەی کە لە هەولێرو لە

بادینان وکویێ وکویێ بوو ون؟! چۆن دەتوانین بڵێین ئێمە لە سەر ڕێبازی ئەوانین و ڕێزمان بۆیان هەیە؟! چی وەك ئەوانمان پێوە دەمێنێ ئەگەر ئەو ڕچەیەی کە ئێستا خەڵکێکی زۆری لە ژێر سایەی هەر دووك ئیدارە کوردی یەکە گرتوویانەتە بەر، بەردەوام بێت؟!

ئێستا نەك تەنها هەر ئافرەتان، بگرە هەر بەرگ و پۆشاکی کوردی بە گ شتی و لە لایەن زۆر بەی چین و تویژەکانی میللەتەکەمانەوە، بە تایبەت لە شارەکاندا بووە بە شتێکی عەیبە! وە چاولێکردن و لاساکردنەوەی بێگانە تەنانەت لە بەرگ و پۆشاکیشدا بۆتە نیشانەی شارستانێتی و پێشکەوتن!! کە ئا ئەوە پێناس(هوية) لێ‌ون بوونەو خۆ لێ‌بزربوون و خۆ دۆڕاندنەو دەروون بەزینەو کەموزۆر پەیوەندی بە شارستانەتییەوە نییە!، چونکە ئێمە سەرنج دەدەین کە یابانیی و چینی و هیندییەکان ئێستاش لەگەڵ بێ دەستەبەرداری بەرگ و پۆشاك و عادەت و نەریت و بەڵکو دەستبەرداری بتپەرستیی خۆشیان نەبوونەو ئێستاش هەر بت و صەنەم و مانگا، یان (بووزا) دەپەرستن، کە بێگومان بتپەرستیی نزمترین شێوەی بیرکردنەوەیە! کە چی دەستبەرداری نەبوونە، بەڵام ئەوە ڕێگاشی لێنەگرتوون کە لە بواری تەکنۆلۆجیادا زۆر بەرەو پێش بچن، تەنانەت لە هەندێك بواردا یابانییەکان پێش ئەمەریکاو ڕۆژئاواش کەوتوونەوە، کەچی

ئێمە دەڵێین: دەبێ بەرگ و پۆشاکەکەشمان نەمێنێ! ئنجا وابزانین بەوە پێش دەکەوین بەڵام هەر لە جێی خۆشمانین، نەك هەر لە جێی خۆمانین بەڵکو زۆریش بەرەو دوا چووینەوە!!

دیارە ڕیشەو هۆکاری ئەو ڕووتی و بەرەڵڵایی و فەسادە ئەخلاقی و بێ سەرەو بەرەییەش، بە پلەی یەکەم بریتییە لە سەرسام( مُعْجَبْ) بوون بە ڕۆژئاواو، کەوتنە ژێر کاریگەریی فەرهەنگی ڕزیو و داتەپیوی ڕۆژئاوا، ئەویش بە هۆی ئیمان کزییو ناحاڵی بوون و حاڵی نەبوون لە شەریعەت و پەروەردە نەبوون لەسەر بنچینەکانی عەقیدەو شەریعەتەوە.

جا ئایا کێ لەو حاڵەت و واقیعەی شپرزیی ئەخلاقییە بەرپرسارە؟!

بەڵێ ئایا کێ لێی بەرپرسیارە؟! لە ڕاستیدا هەموومان لێی بەرپرسیارین، من ناڵێم: تەنیا ئەو ئافرەتە داماو و هەڵخەڵەتاوانە لە بەرانبەر ئەم واقیع و هەلومەرجە دزێوارە ئەخلاقییەدا بەرپرسیارن، هەروەها ناڵێم تەنها ئەو گەنجە داماو و هەرزەکارانە بەرپرسارن کە لە سەنتەری گەنجان و هۆڵەکان و بازەڕەکان و چایخانەکان و پێکەوە کۆدەبنەوە وەك هیچ ئامانجێك نەبێ لە ژیاندا بیهێننەدی مەگەر چاوبازەکێ و قسەی بێ ماناو پیاسەی جادەو کۆڵان نەبێ!

بەڵکو دەڵێم: هەموو لایەکمان لە بەرانبەر ئەم واقیعەدا بەرپرسیارین، چونکە دەبووا پەیڕەوی میللەتی کورد ئەو یازدە( 11 ) ساڵەی دوای ڕاپەڕین خەریکی دروستکردنی ژێرخانی ئابووری کوردستان باین، کوان کارگە (معمل)کانمان؟! کوا کەڵك وەرگرتن لەو هەموو کانزا (معدن)یانەی کە لە کوردستاندا هەن؟! ئێمە وەك بەچکە باڵندە دەمان گرتۆتەوە داخوا کەی بە پێی بڕیاری (986) ئازووقەیەك دابەش دەکرێ و دەبڕێتەوە!، بێگومان هەر میللەتێك میللەتێکی ئیستیهلاکی و (مستهلك)[18] بێ، میللەتێکی دواکەوتوویەو دەبێ هەوڵ بدەین میللەتێکی بەرهەمهێن (منتج) بین، بەڕاستی پێم سەیرە کە برادەرانی خاوەن ئیدارە کە خۆیان بە حوکمڕان دەزانن بیر لەوە ناکەنەوە ژێرخانێك بۆ ئەم میللەتە دروست بکەن تا گەنجەکانمان چی دیکە ناچار نەبن لەبەر بێکاریی ڕوو لە هەندەران بکەن و لەبەر بێئامانجی خۆیان بدۆڕێنن، بێن لە کارگەکاندا بەرهەمێك وەدەست بێن ولات بەرەوپێش بچێت و ئاوەدان بێتەوە خەڵك ئەوەندە هەست بە نائومێدی (یأس) نەکات، لە ڕاستیدا ئەم

(18) الاستهلاك: واتە: بەکارهێنان و سەرف کردن،(مستهلك)یش کەسێکە کە ئەوەی غەیری خۆی بەرهەمی هێناوە بەکاری دەهێنێ و خۆی چ کارە نیە، دەخوات بەڵام ناکات!

تێبینی: دیارە ئێستاکە (2006/12/5)، بۆتە دەوری شازدە(16) ساڵ کە ڕاپەڕینی (1991) کراوە، بەڵام وتارەکە چوار پێنج ساڵ لەمەوبەر دراوە.

واقیعە هەموومان لێی بەرپرسیارین بە ئیسلامییەکانەوە بە تێکڕای خەڵك و میللەتەوە بە ماڵ و خێزانەوە، سوێند بە خوا من پێم سەیرە جاروبار کە هەندێك ئافرەت دەبینم- لەڕێو بان کە چاوت تێی هەڵدەنگوێ- پێم سەیرە کە ئەو ئافرەتە جارێ یەکەم چۆن بۆ خۆی شەرم ناکات کە بە ڕێگادا دەڕوات بەو بەرگ و پۆشاکە نامۆیە کە فەقیرە هەموو ئەندامەکانی دیارن!! پاشان بەلامەوە سەیرتر ئەوەیە کە باب و دایکی چۆن پێیان عەیبە نیە کە ئەو کچە دەچێتەوە تەماشای بکەن، نازانم تەماشای دەکەن یان تەماشای ناکەن؟!! ئایا دەزانن کچەکەیان چۆن دەسوورێتەوە؟! بە ڕاستیی بە ڕاستی زۆرم پێ سەیرە!!، کە بێگومان زۆر شتی خراپتر لەوەش کە لە سەر جادەو شەقام دەبینرێ، دەبیسترێ! زۆر شتی خراپ دەبیسترێ کە شایستەی ئەوە نیە لەسەر مینبەر باسی بکەین! ئنجا نازانم ئایا ئەو ڕووتی و بەرەڵڵاییە سوودو بەرهەمەکەی چیە؟!

1- جاری لە ڕووی ئابوورییەوە زیانی هەیە ئەو ئافرەتە داماوانە زۆریان هەیە قەناعەتی بەو جۆرە بەرگ و پۆشاکە نیە، بەلام دەڵێ: بڵێم چی؟ تازە بۆتە عادەت و مۆدێل ئەگەر وانەکەم لێم بەرەخنە دەگیرێ!، زۆریان هەن تێگەیشتنێکی وایان لە دین نیەو ئیمانێکی دامەزراویشیان نیە، بۆیە کەوتوونە تە ژێرکاریگەریی ئەو مۆدیلانە، بەڵێ لە ڕووی ئابورییەوە ئەو

مۆدێل و مۆدیلکارییە بارێکی قورسە چونکە ئەو ئافرەتە فەقیرە شەووڕۆژ هەر خەریکی خۆی دەبێت و پارەیەکی زۆر بەماڵی بابی مەسرەف دەکات، یان بە ماڵی مێردی، چونکە داوو دەرمان دەکڕێ و میکیاج دەکات، وە هەر ڕۆژەو مۆدیلێك لە بەرگ و پۆشاك لەبەر دەکات و دەیگۆڕێ و.. هتد، ئەوەش بێگومان لە ڕووی ئابورییەوە کۆڵێکی گران و زیانێکی گەورەیە.

2- ئینجا ئەگەر لە ڕووی ئەمنییەوەش تەماشا بکەین دەیبینین لە دادگا(محكمة)کاندا زۆر قەزیەی جینسی و دەستدرێژی نامووس و چی و چی دەچێتە دادگاو، لە ڕووی دادوەرییی و ئەمنییەوە خەڵکێکی زۆرمان سەرقاڵ دەبێ و (ملفات)ی زۆر کۆدەبێتەوە بە هۆی ئەو گرفت وکێشانەوە کە لە سۆنگەی داڕووخانی ڕەوشتەوە پەیدا دەبن و ئەویش ئەو ڕووتی و بەڕەڵاییە کاریگەرترین هۆکاریەتی، ئافرەتێك کە سەرنجی پیاوان بەلای خۆدا ڕادەکێشێ بە بەرگ و پۆشاکی سەیر سەیر وە بە هەڵسوکەوت و ڕەفتاری نەرم و تۆمەتبارانەو گومان لێکراوانە، ئاشکرایە کە دوایی شت دەقەومێت و ئەوەی چاندوویەتی دەیدورێتەوەو خەڵك چاوی تێ دەبڕێت، پاشان کە شت ڕوویدا دەبێ خەرجییەکی زۆر دابین بکرێ بۆ یەکلایی کردنەوەی ئەو کێشانەی کە لەوەوە ڕوو دەدەن و ئابڕووچوون و

كەرامەت ڕووشان و عەیبداریی دنیایی و گوناهباریی و شەرمەزاریی دوارِۆژیش لەوێ بوەستێ !

3- پاشان لە ڕووی خێزانییەوە، وەختێك كە خەڵك ئەوەندە تێكەڵ بوو لە دائیرەكان و لە شوێنە گشتییەكان و لە بازاڕەكان و لە هەموو شوێنێك ئەو ئافرەتە دڵی بەو پیاوەی تردا دەچێ و ئەو پیاوە دڵی بەو ئافرەتەی تردا بكات، ئەوە شتێكی سەیرو دوور نیە كە خیانەتی خێزانی (الخیانة الزوجیة) دروست بێت، وەك بیستراوەو بینراوەو گەلێك ڕووداوی دڵتەزێن لەو بوارەدا زانراون و تۆمار كراون !

4- هەروەها لە ڕووی تەندروستییەوە، ئەو جۆرە بەرگ و پۆشاكە تەسكەو ئەو جۆرە پێڵاوە تەنگە هەموو دكتۆرو پزیشكەكان دەڵێن زۆر خراپە بۆ بەدەنیان، ئەو داو و دەرمانانەی كە لە خۆیانی دەدەن زۆر خراپەو زیان بەخشە بۆ پێستیان، یانی لە هەر ڕووێكەوە تەماشای بكەی ئەو ڕووتی و بێ بەندوباریی و چاولێكردن و لاساییكردنەوەی ئەهلی كوفر، جگە لە زەرەرو زیان هیچ بەرهەمێكی دیكەی نیە، ئیدی ئێمە نازانین چ فەلسەفەیەكی تێدایەو چ هونەرێكی تێدایە؟!، بە تەئكید لە هەموو ڕووەكانی، ئابووریی، ئەدەبیی، فیكریی، زانستیی، تەندروستیی، نەتەوایەتیی، ئەمنیی.. هتد. ەوە ئەو پەڕی زیانی تێدایەو من ناتوانم تاكە قازانج و بەرهەمێكی بژمێرم!

## خاڵی پێنجەم: قسەی کۆتایی: چارەسەر چی یە؟

بەکورتی دەڵێم: چارەسەر ئەوە یە کە لە ڕێ شەوە خۆ مان بگۆڕین و خۆمان پاک سازیی و چاک سازیی ب کەین، چونکە: بێگومان ئێمە کاتی خۆی کە (ڕژێ مى بەعس)مان ڕاو ناو ڕووخاند تەنها ئەوەندە نەبوو کە دەستەڵاتەکەی لەلای خەڵك ڕەفز بێت، بەڵکو ئەو فەرهەنگ و خوو ونەریتە نەفامیی و ڕەو شت نزمییەش کە بەعس بڵاوی دەکردەوە هەر ڕە فز بوو، وە فی کرو فەلسەفەیەکیش کە بڵاوی دەکردەوە دەبێ هەر ڕەفز بێت.

بەڵێ بەڕاستی دەبێ ئێمە شۆڕشێکی عەقیدەیی و فیکر یی و فەر هەنگی ب کەین ئەویش بریتی یە لەگەڕا نەوە بۆ سەر ڕەسەنایەتیی دینی خۆمان، ئێمە میللەتێکی بێ فەرهەنگ و بێ ناسنامە نین، فەرهەنگ و هەویەی خۆمانمان هەیە، و بێگو مان ئەو شۆڕشە عەقیدەیی و فەرهەنگی و فیکرییەش وەك پێوی ست بە هەموو لایەکمان دەکرێت.

دیسان وێڕای ئەو شۆڕش و گۆڕانکارییی وگەڕانەوە سەربەخۆیە عەق یدەیی و فیکری یە، پێوی ستە چاک سازیی لە بواری کۆمەڵایەتیشدا هەر بکرێ. من ئاگادارم زۆر لە ئافرەتان دەیانەوێ شوو بکەن، بەڵام لەبەر ئەو مەرجانەی کە لە نێو خەڵ کدا بوونەتە داب و دەستوورو ڕەسم وەك مەسرەف ومارەیی زۆرو خانووو

زێر.. هتد دەبینین کەس لێیان ناچێتە پێش و لە ئەنجامدا ئەو ئافرەتانە دەمێننەوەو دەبنە قەیرە کچ، هەروەها کوڕان هەن بە هەمان شێوە لەبەر ئەو کۆت و زنجیرانەی کە بە گوێرەی عورف و باوی هەڵەی نێو کۆمەڵگا دەست و پێی خۆمانمان پێ یان بە ستوون و ژن هێنان و شووکردنمان زۆر وەزەحمەت خستوە.

باوریا بین بەدەردی ڕۆژئاوا نە چین، کە لە کتێبێکدا خوێندمەوە.. دەڵێ: لە هەندێك لەو وڵاتانەدا ڕێژەی ژن هێنان بۆتە (40%)! ئەویش دوای ئەوەی کە ئەو ئافرەتە چەندەها پیاو تاقیدەکاتەوە هەروەها پیاوەکەش چەندان ئافرەت!، لە (60%)یش کەس ژن ناهێنێ، دیارە ئافرەتەکانیش شوویان دەست ناکەوێ؟! چونکە هەر لەو جادەو بازاڕە وەك چۆن (سەندەویج)ێك دەخورێت مەسەلەی تێرکردنی جینسیش ئاوای لێهاتوە!، جا ئایا ئێمەش دەمانەوێ ئاوامان لێبێت کە مسۆگەر ماڵی دنیاو دوارۆژمان وێران دەبێ؟!!

کەواتە: با لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە کارێك بکەین کە چاکسازیی تێدا بێت لەو بارەوە با کارئاسانی بکەین بۆ ئەوەی کە کچەکان بە ئاسانی شوو بکەن و کوڕەکان بە ئاسانی ژن بهێنن، بە ڕاستی هەندێك عادەت و نەرێت هەیە کە ڕەواجی سەیرو نامۆو سەغڵەتکەرە، هیچ پەیوەندییان بە شەرعەوە نییە، چونکە لە فەرموودەدا هاتوە دەفەرموێ: باشترین ئافرەت ئەوەیە مارەیی

یەکەی کەم و ئاسان بێت[19]، بەڵێ شەریعەتی خوا حەز دەکات کە بە ئاسانی ماڵ پێکەوە بنرێت، ئەو ئاڵۆزیی و گرێ و گۆڵەی کە ئێمە خۆمان دروستمان کردوە لە شەرع دا نیە.

ئنجا وەك پێشتریش ئاماژەمان پێدا گە شە پ ێدانی لا یەنی ئابووری و دروستکردنی ژێر خان بۆ ئەو خەڵك ومیللە تەو هەوڵدان بۆ بنیاتنانی کۆمەڵێك کارخانەو کارگەو سوود وەرگرتن لەو هەموو کانزاو کەرەسەی خاوو وزەیەی کە لەم وڵات و خاکەی ئێمەدا هەیە بۆ ئەوەی هەم وڵاتمان ئاوەدان بێتەوەو بۆ هەموو شتێك هەرچاو لەدەستی خەڵك نەبین و، هەم چی دیکە گەنج و لاوەکانمان لەبەر بەتاڵیی و بێ کاریی بە ملاولادا نەڕۆن و کچەکان لێرە بمێننەوە بە داماوی، دیارە ئافرەتەکان ڕێی چوونە دەرەوەیان نیە بۆیە ناچار ئەوان بە داماوی دەمێننەوە ئاشکرایشە وەك چۆن ئینسان برسی دەبێت وە تینوی دەب ێت پێوی ستی بە خواردن و خواردنەوە هەیە بۆ تێربوون و تێرا بوون بۆ لا یەنی جینسیش هەر بە هەمان شێوە بە تایبەتیش کە پەروەردەی دینی لاواز بۆ ئەوە بێگومان فشاری جینسیش زۆر دەبێت و لە ئەنجامدا فەسادو خراپە بڵاودەبێتەوە، وە لە ڕاستیدا لایەنێکی زۆری ئەو

---

(19) وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموو یەتی : ( إن أعظم الذكاح بركةً أيسرهُنَّ صداقاً) رواه البيهقي و أحمد عن عائشة رضي الله عنها

بەرپرسیارێتییەش دەكەوێتە سەرشانی ئێمەی ئیسلامیی، ئێمەی ئیسلامیی لە چەند لایەكەوە بەرپرسیارین:

**یەكەم**: كە بەڕوویەكی گەش وخۆش بچینە نێو ئەو خەڵكەوە، بە تایبەت خوشكانمان بەڕووی گەش و خۆش لە گەڵ ئەو ئافرەتانە قسە بكەن و بانگەوازیان بكەن و ئامۆژگاریيان بكەن، نەك بە چاوی دوژمنانەو غەرەزاوییانەوە تەماشایان بكەن، چونكە بە تەئكید بێ ئاگایی و نەشارەزایی گەورەترین هۆكاریی لەخشتەچوون و بەدەم ڕەشەبای شەهوەت و شوبهەوە چوونیانەو، با پێمان وانەبێ كە ئەو خەڵكە هەمووی لە ناخەوە بڕیاری دژایەتی دین و ئەدەب و ڕەوشتی بەرزی داوە!

پێغەمبەری خوا ﷺ لە بواری بانگەوازو هەڵسوكەوت لەگەڵ خەڵكیدا فەرموویەتی: (بشروا ولاتنفروا) (متفق علیه)، واتە: دڵخۆشكەر بن و سڵەمێنەرەوە مەبن، یانی: با شێوەی قسەو وتارو هەڵسوكەوتتان وابێ نیزیكخەرەوە بێ نەك دوورخەرەوە هەروەها دەبێ بەچاوی ڕەحم و سۆزو پەرۆشەوە لە خەڵك و دەوروبەرمان بڕوانین و بەو ڕوو حەوە مامەڵەیان لەگەڵ بكەین، چونكە ئێمە شوێنكەوتووی پێغەمبەرێكین كە نازناوی (رحمة للعالین)ە!! وە فەرمووشیەتی: (من لایرحم لایرحم) (رواه مسلم).

**دووەم:** پاشان پێویستە خۆمان نموونەو بەرجەستەیەکی ڕاست و ڕێکی شەرع بین لە هەڵسوکەوتماندا و ئاڵۆزکاریی (تعقیدات) نەکەین لە مەسەلەی بەرگ و پۆشاکی ئافرەت و هەندێك ئاداب و هەڵسوکەوتدا، چونکە هەندێك خو شك و برای ئیسلامیی لە ژێر فشاری ئەو هێرشە ڕۆژئاواییەدا کە هەیە بەرگ و پۆشاکی ئافرەتانیان وا لێکردۆتەوە کەچی وای لەبەر ڕووت و قووتییەکەی ئەواندا نیە، زیاتریش بە پاڵنەری ئەو کە دەوروبەرە سەرلێشێواوە کە گلەیی لێ نەکەن و لێی ڕازی بن!!

هەندێکیش هەر لە خەڵکی ئیسلامی لە کاردانەوە (رد فعل)دا ئافرەتیان وا سەغڵەت و تەنگەتاو کردەوە پابەندیان کردوە بە کۆمەڵێك شتەوە کە شەرعی خوای پەروەردگار وای نەفەرمووە، وە بێگومان ئایینی خوا هیچ جۆرە سەغلەتکردن و نارەحەتکردنێکی بۆ ئینسانەکان تێدا نیە، وەك خوای دادگەر فەرموویەتی:

﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ﴾ (الحج - 78).

جا بێگومان ئەم دووانە هەردووکیان هەڵەن و، با خۆمان لەو تێپەڕاندن و بەزایەدان (افراط و تفریط)ە بپارێزین و، شەریعەت چۆنی فەرمووەو ڕای بەهێزتر (راجح)ی زانایان چۆنە ئاوا ڕەفتار بکەین،وە با هەرکاتێك مەسەلەیەك جێگای ڕاجیایی (اختلاف)و مشتومڕی زانایان بوو با لە سەر بناغەی سینگ فراوانی و

قبووڵکردنی ڕای بەرامبەرو ڕێزلێگرتنی مامەڵەی لەسەر لەگەڵ بکەین، نەك لەسەر بنچینەی دەمارگیری(تعصب)و لا ساکردنەوە (تقلید)و تەنها خۆ پێ‌هەق بوون!

وەك (ابن المفلح الحنبلي) لە کتێبی (الاداب الشرعیة)داو لە بواری فەرمان بە چاکەو نەهی لە خراپەدا لە بارەی (مە سەلەی دیاربوونی دەموچاوی ئافرەت لە ڕێگەوبان) کە ئا یا درو ستە بەناوی فەرمان بە چاکەکردن و ڕێ لە خراپەگرتنەوە قەدە غە بکرێــت؟!

جا لەو بارەوە پرسیارێك دەورووژێنی و دەڵێ: (ئا یا درو ستە کەسێك بڵێ: نابێ ئافرەتان دەمو چاویان د یار بێت؟! دە ڵێ: نەخێر، چونکە ئەوە مەسەلەیەکی خلافی یە) پاشان ابن (المفلح) خۆیشی ئەو ڕایە پەسەند دەکات کە زۆر بەی هەرەزۆری زا ناو پێشەوایانی ئیسلام پە سەندیان کردوەو دە ڵێ: کە ئافرەت دەموچاوی عەورەت نیە[20] ئاشکراشە کە فەرمان بە چاکەکردن‌و ڕێ لە خراپەگرتن نابێ لەو مەسەلەو بابەتانەدا بکرێ کە زانایان ڕای جیابیان لە بارەیانەوە هەیە.

کەواتە با ئێمەش لە لایەکەوە مەسەلەکە زۆر ئاڵۆز نەکەین و میزاج و تەبعی خۆمان لە ڕ قی خەڵکی بێ بە ندوبارو لە کاردانەوەیاندا- نەکەینە جێگرەوەی شەرع !

---

(20) بڕوانە (الآداب الشرعية) ج 1 ص 359.

لەلایەکی تریشەوە وا نەکەین کە بەرگ و پۆشاکی ئافرەتان بە شێوەیەکی لێبێتەوە کە ئەوەی پۆشتەیە لە گەڵ ئەوەی کە ناپۆشتەیە جیاوازییەکی وای نەبێت، دیارە هەمیشەیش ڕاستە ڕێی شەرع گرتن و بە ملاولادا نەترازان و گیرۆدە نەبوونی تێپەڕاندن و بەزایەدان مایەی سەرکەوتنە لە دینداریيەکی ڕاست و دروستدا.

ئنجا کۆتایی قسەکانیشم بەوە دێنم دەڵێم: بە ڕاستی پێویستە ئێمەی ئیسلامیی بەرامبەر بە میللەت و کۆمەڵگای خۆمان لە هەموو ڕووەکانی سیاسی و ئابووریی و کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی و فەرهەنگییەوە خۆمان بە بەرپرسیار بزانین، جا ئەو خۆ بە بەرپرسیار زانینە ئەگەر بە قسەیەکی خێریش بێت دەبێ ئەو ئەرکەی سەر شانمان جێبەجێ بکەین و، هەر چییەکیش لە دەستمان بێ نابێ کەمتەرخەمیی تێدا بکەین، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (کلکم راع وکلکم مسؤول عن رعيته...) (متفق علیە)، واتە هەرکامێکتان چاودێرەو بەرامبەر بە میللەت و کۆمەڵگایەکەی بەرپرسیارە.

بەڵێ خوشك و برایەکانم پێویستە گوتنی هەقێکیش بێ ئەرکی سەرشانمان جێبەجێ بکەین چونکە ئەم میللەتەی ئێمە پاراستنی و سەرخستنی و بەختەوەرکردنی، بەرپرسیارییەك و ئەرکێ کە لەسەر شانی هەموو لایەکمانە، ئێمەش وەك ئیسلامیی دەبێ خۆمان بە بەرپرسیار بزانین کە ئەگەر بە ئامۆژگاری و قسەیەکی

خێرو بە بەرچاو ڕوونکردنەوەیەکی خێریش بێ کە بێگو مان ئەمەش کەم نیە و زەحمەتیش نیە، پێویستە ئەدای ئەو بەرپرسیارێتییە بکەین، بەڵام دەبێ دڵنیاش بین کە بە دەستبار بۆ یەکتر گرتنی هەموو لایەك نەبێت ئەم وەزعە چارەسەر ناکرێت و، دەبێ هەموو لایەك دەستبار بۆ یەکتر بگرین بە تایبەتی هەردوو ئیدارەکەی سلێمانی و هەولێری برادەرانی (یەکێتی و پارتی) بە ڕاستی پشکی گەورەی ئەو بەرپرسیارێتییە بەر ئەوان دەکەوێت[21] و ئەرکی گەورە لەسەر شانی ئەوانە، دەبێ ئەوان دووربین و وردبین بن لەوەی کە ئەو کۆمەڵگایە بەرەو چی دەچێت لەڕووی سیاسییەوە پرۆژەی سیاسیمان چیە؟! چۆن ئەو کیان و قەوارەیە بپارێزین لە ڕووی ئابووریی و لەڕووی کۆمەڵایەتی و لە ڕووی فەرهەنگییەوە؟ بۆچی دەبێ ئێمە هەر شوێنیکەوتە و لاساکەرەوەی خەڵکێك بین کە خوا خەشم و غەزەبی خۆی بەسەردا ڕشتوون و خۆیان گیریان خواردوە بەدەستی خۆیانەوە؟!!

---

(21) چونکە ئێستاکە ئەوان حوکمڕان و کاربەدەستن و وار یداتی وڵاتیان لەبەردەستدا یەو خێرو شەڕیان لەدەست دێ و تاڕادەیەکی زۆر جڵەوی وڵاتیان بەدەستەوەیە! تێبینی ئەم وتارە هی (2002)یە کە ئەو کاتە دوو ئیدارە نەخرابوونەوە سەریەك، ئێستاش بە حیساب خراوەنەتەوە سەریەك بەڵام دوو فلیقانەیی و ناتەبایی هەر زۆرە! (5/12/2006)

بۆ چی نابێ بیرێکی جیددی بکەینەوە کە گۆڕان و وەرچەرخانێکی ڕیشەیی لەهەموو بوارەکانی ژیان و گوزەراندا ڕووە و ئیسلام بەسەر خۆمان دا بهێنین؟!!

ئەوە بێگومان ئەرکێکە کە لەسەر شانی هەموو لایەکمانە کە زۆر بە جیددی بیر لە چارەنووس و سەرەنجامی ئەو خەڵك و میللەتەمان بکەینەوە کە بەرەو هەڵدێر نەچێت و لە داڕووخاندنی ڕەوشت بە دوور بێت و لە هەر جۆرە پاشکەوتن و هەرەس و داڕووخانێکی دیکە لە هەموو بوارەکانی عەقیدەو سیاسەت و ئابووریی.. هتد بەدوور بێ...

خوا بەلوتف و کەرەمەتی خۆی یارمەتی هەموو لایەکمان بدات کە زۆر دڵسۆزانە ئیش بۆ ئەم میللەتە بکەین و بیگێڕینەوە ژێر سایەی شەریعەتی خۆی، خوایە داوات لێدەکەین کە بەرچاو ڕوونترمان بکەی، وە خوایە هیدایەتمان بدەی چیت فەرمووە جێبەجێی بکەین، خوایە حەیاو حەشمەتی زیاتر بە ئافرەتەکانمان بدەی، خوایە ئابڕوو کەرامەتی زیاتر بە گەنجەکانمان ببەخشی، خوایە دڵسۆزیی و مەشوورخۆیی و دووربینی و دادگەریی بە بەرپرسەکان ببەخشی، خوایە یارمەتی هەموو لایەك بدەی کە بە شێوەیەك بجووڵێنەوەو ڕەفتار بکەن، کە شایستەی میللەتێکی موسڵمان بێ، کە شایستەی کۆمەڵێك بێ

کە خۆیان بە شوێنکەوتووی پێغەمبەر ﷺ و ئومەتی ئەو دەزانن!

خوایە شیفای نەخۆشەکانمان بدەی، خوایە قوتابییەکانمان لە کاتی تاقیکردنەوەکانیان دان یارمەتییان بدەی سەعی و کۆششی باش بکەن و پلەی باش بێنن، خوایە هەر موسڵمانێك هەرگرفت و کێشەیەکی هەیە بۆی چارەسەر بکەی. ئامین.

وصلى الله على محمد و اله وصحبه اجمعين

والحمد الله رب العالمين

# نێـوەڕۆك

# چاوەڕوانی ئەم نامیلکانەش بن.

١. بەدەرخستنەوەی ئافرەت لە ئیسلام چ زیانێک دەکەین



٢. چۆنیەتی بوونە پێشەنگ و بنیاتنانی بنکەی جەماوەری

٣. خوو ڕەوشتی پەسند سەنگی مەحەکی موسوڵمانەتییە

٤. قوتابیانی زانیاری شەرعی و چەند ڕێڕەوێک

٥. چەند بنەمایەکی گرنگی وتاربێژی.

٦. سیاسەتی ئیسلامی و چەند ڕوونکردنەوەیەک







نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن



هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر نوتێلی شیرین پالاس

ت: 2518138 - 2230908 - 2221695

موبایل: 07504605122 - 07701387291

tafseeroffice@yahoo.com

tafseeroffice@maktoob.com

altafseer@hotmail.com